

# یەکەمین ڕووناکی

فۆتۆئەلبوم

ئاکاش فۆتۆگرافەرێکی بەنگلادیشییە و زیاتر لە بیست ساڵە وەک فۆتۆگرافەری ئازاد کار دەکات. بەشێکی زۆری فۆتۆکانی ئاکاش، فۆتۆی ئۆردوگا و کۆڵانە هەژارنشینەکان و فۆتۆی کەسە نەدارەکانی ناو شارەکانی بانگلادیشن لە کاتی کارکردن یاخود دەرۆزەکردندا و گەڕان بەدوای ژەمە خۆراکێکدا. ئاکاش بەر لە گرتن و دوای گرتنی فۆتۆی کەسەکان، دەیاندوێنێت و قسەیان لەگەڵ دەکات. داوایان لێدەکات چیرۆکی ژیانیان بگێڕنەوە، یاخود کۆمەڵێک پرسیاریان لێدەکات. یاخود زۆر بەسادەیی لێیان دەپرسێت، «شتێکت هەیە بیڵێیت؟» یاخود، «پێتخۆشە شتێکم بۆ باسبکەیت؟» دواتر قسەکان و فۆتۆکە لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان و وێبسایتەکان بڵاودەکاتەوە و ساڵانە چەندین پێشانگەشیان بۆ دەکاتەوە و لە کۆتاییشدا لە شێوەی کتێبدا چاپیان دەکات. تا ئێستا دوو کتێبی چاپکردووە کە ئەوانیش (یەکەمین ڕووناکی) و (دەربازبوەکان)ن. ئەم کتێبەش بەشێکی فۆتۆکانی ئاکاشن کە لەم چەند ساڵانەی دواییدا چرکاندونی و بڵاوی کردونەتەوە.

# یەکەمین ڕووناکی

## فۆتۆئەلبوم

فۆتۆ و چیرۆک:
G.M.B Akash

دیزاین و کاری هونەری:
محەممەد عوسمان

وەرگێڕان:
کانیاو سوعاد
کەژان سروە
هەڵۆ بەدری

کتێبفرۆشی ڕەنج
RANJ BOOKSTORE
٢٠١٧

# یەکەمین ڕووناکی

## فۆتۆئەلبوم

فۆتۆ و چیرۆک:
G.M.B Akash

وەرگێڕان:
کانیاو سوعاد
کەژاڵ سروە
هەڵۆ بەدری

دیزاین و کاری هونەری:
محەممەد عوسمان

٢٠١٧

## چەند سەرنجێک:

«من خەڵکی بەنگلادیشم، دۆخی ژیان لەوێ زۆر خراپە. خەڵکی تەنانەت مافە سەرەتاییەکانی ژیانیشیان نییە. ئاوی پاکیان نییە بۆ خواردنەوە، پەناگەیەکیان نی یە تێیدا بژین، خواردنیان نییە، هەموو ڕۆژێک لە بەیانیەوە تا ئێوارە کار دەکەن و ڕۆژانەکەشیان تەنها ٢ دۆلارە،بگرە کەمتریش.

بەڵام گرنگترین شتی ئەوان ئەوەیە کە هەرگیز کۆڵ نادەن، هەرگیز گلەیی لە ژیانی خۆیان ناکەن، لە ناخەوە زۆر بەهێزن، کاتێک سەیری چاویان دەکەیت بە ئاشکرا ئەوە دەبینیت چەندە بەهێزن!

من سەردانی زۆر وڵاتی ئەوروپیم کردووە، دەبینم لەوێ خەڵکی زۆر دڵخۆش و بەختەوەرن. ئەگەر بەنگلادیش و ئەوروپا بەراورد بکەم بە یەک، ئەوا دەڵێم ئەوروپا بەهەشتە، بەڵام من دۆزەخەکەی خۆمم خۆشتردەوێت و دەمەوێت لەوێ بمرم.»

ئەمە وتەی دەستپێکی (ئاکاش)ە، کە لە سیمینارێکدا بۆ پرۆگرامی (TED)، ساڵی ٢٠١١ لە پۆرتۆ پێشکەشی کرد.

ئاکاش فۆتۆگرافەرێکی بەنگلادیشییە و زیاتر لە بیست ساڵە وەک فۆتۆگرافەری ئازاد کار دەکات. بەشێکی زۆری فۆتۆکانی ئاکاش، فۆتۆی ئۆردوگا و کۆڵانە هەژارنشینەکان و فۆتۆی کەسە نەدارەکانی ناو شارەکانی بانگلادیشن لە کاتی کارکردن یاخود دەرۆزەکردندا و گەڕان بەدوای ژەمە خۆراکێکدا. ئاکاش بەر لە گرتن و دوای گرتنی فۆتۆی کەسەکان، دەیاندوێنێت و قسەیان لەگەڵ دەکات. داوایان لێدەکات چیرۆکی ژیانیان بگێڕنەوە، یاخود کۆمەڵێک پرسیاریان لێدەکات. یاخود زۆر بەسادەیی لێیان دەپرسێت، «شتێکت هەیە بیڵێیت؟» یاخود، «پێتخۆشە شتێکم بۆ باسبکەیت؟» دواتر قسەکان و فۆتۆکە لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان و وێبسایتەکان بڵاودەکاتەوە و ساڵانە چەندین پێشانگەشیان بۆ دەکاتەوە و لە کۆتاییشدا لە شێوەی کتێبدا چاپیان دەکات. تا ئێستا دوو کتێبی چاپکردووە کە ئەوانیش (یەکەمین ڕوناکی) و (دەربازبوەکان)ن. ئەم کتێبەش بەشێکی فۆتۆکانی ئاکاشن کە لەم چەند ساڵانەی دواییدا چرکاندونی و بڵاوی کردونەتەوە.

زۆرن ئەو کێشانەی لە ئێستادا مەترسین بۆ تەواوی مرۆڤایەتی و کار بۆ بنەبڕکردنیان دەکرێت. لە مەترسیدارترینی ئەو کێشانەش، گەرمبوونی زەوی، زیادبونی ژمارەی دانیشتوان، هەژاریی، کەمی خۆراک و ئاوی خواردنەوە، جەنگ و چەکی کۆمەڵکوژ، کەمبونەوەی سەرچاوەکانی وزە، مادەی هۆشبەر، سەرکردەی خراپ، ئایدز و نەخۆشی شێرپەنجە و مەلاریا، (سەرچاوەی هەموو ئەو کێشانەش بۆ خۆشنەویستنی مرۆڤ دەگەڕێتەوە لە لایەن مرۆڤەوە. گەر مرۆڤ، مرۆڤی خۆشویستبا، ئەواژیانێکی باشتری بۆ فەراهەم دەکرد و نەیدەهێشت هیچ کام لەو کارەساتانەی سەرەوە ڕوبدەن.) بەڵام ئەو کێشەیەی کە زۆر بە زەقی

لەم فۆتۆئەلبومەدا باسکراوە، کێشەی برسێتییە. برسێتی، ڕۆژانە بەبەرچاوی هەموومانەوە هەزارەها کەس دەکاتە قوربانی. لەکاتێکدا کاربۆکردن و وەستاندنی، کارێکی زۆر ئاسانە و لە ماوەی چەند مانگێکی کەمدا دەتوانرێت کۆتایی بەو کارەساتە بهێنرێت. بۆیە لێرە بەشێکی زۆری باسەکەمان لەسەر برسێتی و هۆکارەکانی دەبێت.

ئەگەر کەمێک لەو کێشانەی سەرەوە وردبینەوە، دەبینین کە هەموو کێشەکان، پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆیان پێکەوە هەیە. دواجاریش زۆربەی کێشەکان دەگەڕێنەوە بۆ سەرمایەداریی. ئەگەر سەرمایەداریی بەم جۆرە بێ ئەندازەیە ئامێری ناپێویست و بێکەڵکی دروست نەکردایە و ژمارەی دروستکردنی بەرهەماکانی خۆی بۆ کۆنترۆڵ بکرایە، ئێستا بەم جۆرە ژینگە پیس نەدەبوو و ئەو وڵاتانەی کێشەی نەبونی ئاوی شیرینیان هەیە بۆ خواردنەوە، کێشەکەیان هێندە گەورە نەدەبوو و پاتری و پلاستیک و پاشماوەی ئامێرە زیادە و بێ کەڵکەکان فڕێنەدەدرانە ناو ئاو و ژێر زەویەوە و زەوییە کشتوکاڵیش بەم جۆرەی لێنەدەهات.

هەمیشە هەوڵی ڕاستەقینە هەبووە بۆچارەسەرکردنی ئەو کێشانە، بەڵام بەهۆی ململانێی سیاسی و بازرگانییەوە، ئیش بۆ چارەسەرکردنی هیچ لەو کێشانە بە جۆرێک قوڵ نەبووە تا بتوانرێن بنەبڕ بکرێن. چونکە هەر یەک لەو کێشانە، کۆمەڵێک بازرگانی گەورە و سەرمایەدار و سیاسی و دەوڵەتی زلهێزیان لە پشتەوەن. لەبەر هەموو ئەم هۆکارانە، کێشەکان بە چارەسەر نەکراوی ماونەتەوە.

هەوڵدەدەم لە خوارەوە ئاماژە بە چەند خاڵێکی دیار و بەرچاو بدەم کە بونەتە هۆی برسێتی لە چەندین وڵاتدا.

## یەک

یەکێک لە کێشەکانی وڵاتە برسییەکان، سەرکردەی خراپ یاخود ناهۆشیارە. نەبونی هۆشیاری سیاسی و دارایی لای سەرۆکەکانی بەشێکی زۆری وڵاتانی جیهانی سێهەم، دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی دەستنیشانکردن و هاتنە سەر کورسی دەسەڵاتی ئەو سەرۆکانە. بەشێکی زۆری سەرۆکەکانی ئەم ناوچانانە، لە ئەنجامی کودەتا، یاخود پشتاوپشتکردنی دەسەڵاتەوە هاتونەتە سەرکورسی دەسەڵات. لەبەر ئەمە ئاستی زانیاری و هۆشیاری سیاسیان بە جۆرێک نییە بتوانن داهاتووی وڵات و نەتەوەکەیان ببینن و کاری بۆ بکەن. فرێد سوانیکیر لاوێکی خەڵکی غانایە و لەشوێنێکی قسەکانیدا لە کۆڕێکدا کە بە ناوی (ئەو سەرکردانەی ئەفریقایان وێرانکرد، ئەو نەوەیەی کە دەتوانن چاکی بکەنەوە) لەسەر ڕۆڵی سەرکردە لە وێرانکردن یاخود بەرەوپێشبردنی وڵاتدا کردی، دەڵێت، «ئەو گۆرانکارییەی سەرۆکێک لە ئەفریقا دەتوانێت ئەنجامی بدات، گەورەترە لە هەر گۆڕانکارییەکی دیکە کە هەر سەرکردەیەکی دیکە دەیکات لە جیهاندا. لەبەر ئەوەی ئێمە لە ئەفریقادا، ئاستی مەعریفی دامەزراوەکانمان و دەزگا یاساییەکان و بنەما دەستوریەکانمان و ئاستی

هۆشیاری هاولاتیانی سڤیل و تا دوایی هەموو لە ئاستێکی نزم و لاوازدایە. من پێموایە لە هەرچ ولاتێک، کۆمەڵگە دامەزراوەی بەهێزی هەبێت، ئەو گۆڕانکارییەی کە سەرۆک دەتوانێت بیانکات دیاریکراو دەبێت. بەهەمان شێوەش ئەگەر دامەزراوەکانی ولات لاوازبوون، ئەوا یەک سەرۆک دەتوانێت ئەو ولاتە بڕوخێنێت یاخود بە پتەوی دروستی بکات. با نمونەیەکتان بۆ بهێنمەوە تا زیاتر قسەکانم ڕونبکەمەوە. وادابنێ تۆ دەبیت بە سەرۆکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. بە خۆت دەڵێیت، «واو من ئێستا گەیشتم بەوەی کە دەمویست. ئێستا من بەهێزترین کەسم لە دونیادا.» بەڵام کاتێک دەتەوێت لە یاسایەک لابدەیت، کۆنگرێس لەولاوە پێت دەڵێت، «نا نا نەخێر ناتوانیت شتی وابکەیت.» دەتەوێت ڕێگەیەکی دیکە بگریتە بەر، بەڵام لە ئەنجومەنی پیرانەوە پێتدەڵێن، «نەخێر، پێمان وانییە بتوانیت ئەوە بکەیت.» دواتر بە خۆت دەڵێیت، باشە با هەندێک پارە چاپ بکەم، تا ئاستی دارایی بەرزببێتەوە. لێرەدا سەرۆکایەتی بانکی ناوەند پێیان وایە تۆ شێت بویتە. ڕەنگە لەسەر ئەمە لێپێچینەوەشت لەگەڵ بکرێ و تۆمەتیشت بدرێتە پاڵ. بەڵام کاتێک دەبیت بە سەرۆکی ولاتێکی وەک زیمبابۆی. بەخۆت دەڵێیت، «بەڕاستی ئەمە ئیشێکی خۆشە، حەزدەکەم هەتا هەتایە لەسەرئەم کورسییەبم.» (بێگومان دەشتوانیت تا هەتا هەتایە لەسەر کورسییەکەشت بیت). کاتێک دەتەوێت پارە چاپ بکەیت، پەیوەندی دەکەیت بە سەرۆکایەتی بانکی ناوەندەوە و فرمانیان پێدەکەیت و دەڵێیت، «دوو هێندەی ئێستا پارە چاپ بکەن.» ئەوانیش دەڵێن، «بەسەرچاو گەورەم. ئەی هیچ فرمانێکی دیکەت نییە بۆت جێبەجێبکەین؟» ئەمە ئەو هێزەیە کە سەرۆکەکانی ئەفریقا هەیانە. هەر لەبەر ئەمەشە کە دەتوانن گەورەترین گۆڕانکاری ئەنجام بدەن.»[١]

لە ولاتێکی وەک نەیجیریا کە گەورەترین ولاتی ئەفریقایە بۆ هەناردەکردنی نەوت، ٪٧٠ ی دانیشتوانەکەی لە خوار هێڵی هەژارییەوە دەژین، ئەمەش لەبەر نەبونی سەرکردەیەکی هۆشیارە، کە بتوانێت کار بۆ ئێستا و داهاتوی ولاتەکەی بکات. [٢]

## دوو

چەک، یەکێکە لە گەورەترین هۆکارەکانی هەبوونی برسیەتیی لە دونیادا. (هەڵبەتە ئاشکرایە کە برسیەتی و جەنگ دوانەیەکی لێک دانەبڕاون، بەڵام لێرەدا قسە لەسەر برسێتی دەکەین).

بایدۆوا شارێکە لە سۆماڵ. ڕۆژنامەکان بە شاری مەرگ ناوی دەبەن. چونکە هێندەی ئامارەکان چاویان لەسەری بوبێت ٣٠٠،٠٠٠ کەس بە هۆی برسێتی و جەنگەوە لەوێ گیانیان لەدەست داوە. دکتۆر سامانتا نەت دەگێڕێتەوە، «دوای ئەوەی بینیم کۆمەڵێک ژنی زۆر بە خۆیان و منداڵەکانی باوەشیانەوە لەبەردەم سەنتەری خواردنپێدانێکدا بە ڕیز وەستاون، من لە یەکێکیان نزیک بومەوە کەمێک قسەم لەگەڵ کرد. کاتێک ویستم پەنجەم بخەمە دەستی منداڵەکەی باوەشیەوە، ڕاستەوخۆ زانیم کە منداڵەکەی چەند کاتژمێرێک

دەبێت گیانی لەدەستداوە. دواتریش بۆم ڕونبوەوە کە بۆ ماوەی دوو ڕۆژ ئەم دایک و منداڵە لە لایەن گروپێکی گەنجی نەوجەوانی چەکدارەوە، دەستبەسەر بون و داوای پارەیان لێکردووە. دوای ئەوەی کە پشکنیویانەوە و دڵنیابونە کە هیچ پارەکەیەکی پێ نییە، هێشتا هەر سوربونە لە داواکردنی پارە و دواتر دوای دوو ڕۆژ زیندانیکردنی بێ خواردن، ئازادیان کردون. لەوکاتەدا بووە کە منداڵەکەی گیانی سپاردووە.»

کەواتە هەبوونی چەک تەنها لەوکاتانەدا هەژاری و برسیەتی دروست ناکات کە جەنگ هەڵدەگیرسێت. بەڵکو زۆر جاریش وەک ئەو چیرۆکەی خاتوو سامانتا، چەک دەبێتە هۆی دروستبونی گروپ و تاقم و میلیشیا و ئەوانیش تاوان دەکەن و خەڵک برسی دەکەن و خەڵک دەکوژن. ساڵانە بە هۆی هەبوونی چەکەوە، ئەم گروپانە چەندین تاوانی کوشتن ئەنجام دەدەن و بەرهەمی جوتیاران دەبەن و خەڵکی دەڕوتێننەوە، تەنها لەبەر ئەوەی کە ئامێری ئەنجامدانی توندوتیژییەکەیان پێیە کە (چەک)ە.

لە چەند بەشێکی ئەو وڵاتانەدا، کە منداڵەکانیان دەگەنە دە ساڵ، لەکاتێکدا نەچون بۆ خوێندنگە، بەڵام بە چەکەکانی دەستیان خەڵکیان کوشتووە.

لە ئێستادا زیاتر لە ٨٠٠ ملیۆن چەکی بچوک و چەکی دەستی هەیە لە دونیادا. بەشیکی زۆری ئەم چەکانەش بەو گروپ و تاقمانەن کە ڕۆژانە خەڵکی دەکوژن و هەڕەشە لە خەڵک دەکەن و خەڵک بریندار دەکەن و خەڵکی لاقە دەکەن. بە هۆی چەند چەکێکی هەرزان بەهاوە. کە دەڵێم هەرزان، ئاگاداری ئەوە هەم لە هەندێک شوێن تۆ دەتوانیت چەکێکی کلاشینکۆف بە ١٠ دۆلار بکڕیت. لە هەندێک شوێنی ئەفریقا، پەیداکردنی چەک زۆر ئاسانترە لە پەیداکردنی ئاوی خواردنەوە.

ئەگەر ئەو پارەیەی لە بازرگانی چەکدا خەرج دەکرێت، دابەشی بکەین بەسەر هەر تاکێکدا لەسەر زەوی، ئەوا هەر تاکێکمان بڕی ٢٤٩ دۆلارمان بەردەکەوێت. ئەم برە پارەیە ١٢ جار لەو بڕە پارەیە زیاترە کە لە هۆکارە خزمەتگوزاریەکاندا خەرجدەکرێت وەک (تەندروستی و پەروەردە و هۆکارە خزمەتگوزاریەکانی وڵاتانی باشوور)

٨٠٪ ی چەکی دونیا لە شەش وڵاتەوە بەرهەم دێن کە ئەوانیش (ئەڵمانیا، فەڕەنسا، بەریتانیا، ڕوسیا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، چین)ن. [٣]

## سێ

گرەی ئۆپنهەیمەر، باسێک دەوروژێنێت، کە تا ڕادەیەک نوێیە و پێشتر زۆربەمان درکمان پێنەکردووە. لە قسەکانیدا، بە نمونە ئەمریکا دێنێتەوە. پێمخۆشە بە کورتی کرۆکی قسەکانیتان بۆ بگوێزمەوە و نمونەکەش لە ئەمریکاوە گەورەتر بکەم و بیبەستمەوە بە هەموو جیهانەوە.

«وا دابنێ تۆ دەتەوێت هاوکاری خێزانێکی برسی بکەیت و خواردنی ژەمێکیان بۆ دابین بکەیت و لە ڕێگەی ڕێکخراوێکەوە بینێریت بۆ خێزانەکە. لێرەدا تۆ یان ئەوەتا لە چێشتخانەکەتدا دەست دەدەیتە خۆراکێکی لە قوتونراو و دەینێریت، یاخود دەچیت بۆ مارکێتێک، بەبڕی ١٠٠ دۆلار خۆراک دەکڕیت و بۆیان دەنێریت. چۆن دەینێریت؟ خۆت دەیبەیت بۆ ڕێکخراوەکە، یان لەڕێکخراوەکەوە کەسێک دێت لێت وەردەگرێت. دواتر ئەم خواردنەی تۆ دەچێتە عەمبارە گەورەکانی خۆراک و لەوێ کۆمەڵێک کەس دێن خۆراکەکان جیادەکەنەوە و پۆلێنی دەکەن و دواتر ئەم خۆراکانە دەپێچنەوە و بە هەرچ هۆکارێک بێت لە هۆکارەکان، دەیگوێزێنەوە بۆ ئەو وڵاتە برسییە دیاریکراوە و لەوێش دیسان دەخرێتە عەمبارێکەوە و کۆمەڵێک کارمەند ئەرکەکان ڕادەپەڕێنن و شتەکان دەکەنەوە و پۆلێنی دەکەنەوە و دواتریش دەیدەن بە خێزانێک. ئەو خۆراکەی کە تۆ بەبڕی ١٠٠ دۆلار بووە، دەتوانێت بۆ مانگێک خێزانێک تێربکات و تۆش بەمە دڵخۆش دەبیت.

زۆر باش دەبوو ئەگەر ئەمە ڕوی بدایە. بەڵام بەداخەوە شتەکان بەم جۆرە ناڕۆن، ڕاستە هەموو ئەو هەنگاوانەی سەرەوە کە باسمانکردن ڕوودەدەن، بەڵام پارەکەی تۆ تەنها ١٠ دۆلاری دەگاتە جێی خۆی و ٩٠٪ ی نامێنێت. چۆن نامێنێت؟ بۆ نامێنێت؟ چی لێدێت؟ با ئەمە ڕونبکەمەوە.

کاتێک تۆ دەچیت بۆ مارکێتەکە و لەوێشەوە بۆ کۆگاکە، تۆ بەنزین یاخود گاز دەسوتێنیت. یاخود کارمەندێک دێت لێت وەردەگرێت، کە بۆ ئەو کارە دانراوە و مانگانە بڕە پارەیەک وەردەگرێت و دیسان ئوتومبیلەکەی ئەویش بەنزین سەرف دەکات. دواتر کاتێک خواردنەکەت گەیشتە عەمبارەکە، لەوێش کۆمەڵێک کەس هەن کارەکانی ئەوێ دەکەن و شتەکان جیادەکەنەوە و پۆلێنی دەکەن و دواتر دەیپێچنەوە و دەینێرن و دیسان ئەمانیش مانگانە پارە وەردەگرن. دواتریش بە هەرچ ڕێگەیەک بێت خۆراکەکان دەگوێزرێنەوە بۆ ئەو وڵاتەی پێویستە و دیسان بە فڕۆکەبێت یان کەشتی، کەسانێکی زۆر ئەم کارە دەکەن و مانگانە پارە وەردەگرن. سەرنج بدەن تا ئێستا چەند کەس ئیشیان کرد و پارەیان وەرگرت و پارە لە بەنزیندا خەرج کرا! دواتریش کە خواردنەکە گەیشتە وڵاتی مەبەست، هەمان ئەم شتانە دوبارە دەبنەوە و چەند کارمەندێک ئەم کارانە دەکەن و دیسان مانگانە پارەیەک وەردەگرن. خواردنەکەت گەیشتە جێیگەی خۆی، بەڵام تەماشاکە چەند کەس مانگانە پارەیان وەرگرت. ئەم پارانە لە چی دەدرێن؟ لەو بڕە پارە خێرخوازیە دەدرێن کە بۆ ڕێکخراوەکە دێت. (من ئەم قسانە دەکەم، ئاگاداری ئەوەم کە ئەم کەسانە بێ بەرامبەر پارە وەرناگرن، ئەوان هێندەی ئەو پارەیە کاریان کردووە و ڕەنگە ماندوتریش بوبێتن. ڕەنگە تۆ پێتوابێت ئەمە باشە چونکە دەستی کار زیاتر دەکات و بەم هۆیەوە کەسانێک بژێوی ژیانیان دابین دەکەن. بێگومان ڕاستە، بەڵام نابێت دەستی کار لە پارەی خێرخوازی بدرێت، چونکە پارەی خێرخوازی تەنها موڵکی خێزانە برسی و هەژارەکانە.)

یاخود ڕەنگە ئەو خۆراکەی تۆ دەینێریت، ماوەی بەسەرچونەکەی زۆری نەمابێت. یاخود زۆری ماوە

بەسەر بچێت، بەڵام تا دەگاتە ئەوێ بەسەر دەچێت. بۆیە لەوێ فڕێدەدرێت. یاخود تۆ خواردنێکت کڕیوە و دەینێریت و دەگاتە شوێنی خۆی، بەڵام ئەوەی تۆ کڕیوتە، گۆشتی بەرازی تێدایە. بەڵام لەو وڵاتەی کە بۆی چووە خەڵکی گۆشتی بەراز ناخۆن. یاخود جۆرە گۆشتێک یان جۆرە خۆراکێکی دیکەی تێدایە، کە خەڵکی ئەو ناوچەیە نایخۆن. بەم جۆرە فڕێدەدرێت. هەموو ئەم هۆکارانە وادەکەن کە ٪۹۰ ی بڕی پارەکەی تۆ بەفیڕۆ بڕوات.

بۆیە باشترین ڕێگە ئەوەیە کە پارەکەیان ڕاستەوخۆ بۆ بنێرین بۆ سەر ژمارەی بانکیەکەیان. بەم جۆرە هیچ پارەیەک بەفیڕۆ ناچێت و ٪۱۰۰ ی پارەکەت دەگاتە شوێنی خۆی و ئەوانیش دەتوانن لەوێ چ شتێکیان پێویستە ئەوە بکڕن و دابەشی بکەن.»[٤]

لە دونیادا خۆراک زۆر لەوە زیاتر بەرهەم دەهێنرێت کە پێویستمانە بۆ نەمانی برسییێتی. ئەگەر وایە بۆ بەشمان ناکات؟

خۆراک بەشی هەموو دانیشتوانی زەوی هەیە. بەڵام ۳/۱ یەک لەسەر سێی خۆراکی بەرهەم هێنراو لە جیهاندا، پێش ئەوەی بگەنە خەڵکی، لە ناو دەچن. بەهۆی کێشەکانی وەک (چۆنیەتی دورینەوە، چۆنیەتی گواستنەوەیان بۆ عەمبارەکان، چۆنیەتی هەڵگرتنیان لە عەمبارەکاندا، چۆنێتی پێچانەوەیان، چۆنیەتی ناردنیان بۆ وڵاتە دورەکان، فرۆشتنیان بە کڕیارەکان و لە کۆتاییشدا هۆکارەکانی ڕێگەوبان).

بەشێکی ئەو خواردنانە لە ڕێگەی گواستنەوەیاندا بۆ بازاڕەکان خراپ دەبن، بەشێکیان لەسەر سنورەکان خراپ دەبن کاتی ساغکردنەوەیان بۆ کڕیارەکان، هەندێکیشیان هەر لە کێڵگەکە پێش دورینەوە خراپ دەبێت. چونکە جوتیارەکە پێی وایە پارەی کەم دەکات و پێویست ناکات بۆ داهاتێکی کەم خۆی ماندوو بکات. لە هیندستان،٪۳۰ ی خواردن و سەوزە و میوەی بەرهەم هێنراو، پێش ئەوەی بگەنە خەڵکی و بەکار بهێنرێن، خراپ دەبن. بە هۆی خراپی هەڵگرتن و عەمارکردن و گواستنەوەیانەوە. لە ئەفریقا، جوتیاران ٪۳۰ – ٤٠ ی بەرهەمەکانیان دوای دورینەوەیان خراپ دەبن. بە هۆی خراپی و نەبونی شوێنێک بۆ هەڵگرتنی خۆراکەکان وەک عەمبار و سایلۆ. ئەو ڕێژە زۆرە خۆراک خراپ دەبێت بەهۆی باران، یاخود گەرما، یاخود مێروو، یاخود بەسەرچوون و وشکبونەوە و کەڕو و شیَ–وە.

دەرکەوتووە ئەو خواردنەی کە تەنها لە ئەفریقا خراپ دەبێت و فڕێ دەدرێت، بە شی ٤٩ ملیۆن کەس دەکات. ڕێگەم بدەن ئەو ژمارەیە دوبارە بکەمەوە. تەنها لە ئەفریقا، خواردن بەشی ٤٩ ملیۆن کەس خراپ دەبێت و فڕێدەدرێت. بە هۆی نەبونی ئامێر و شوێنی تایبەت بە دورینەوە و هەڵگرتن و گواستنەوە.

## چوار

«ژن بەشێک نییە لە کێشەکە، بەڵکو بەشێکە لە چارەسەر.»

ڕەنگە هەموو پێمانوابێت لە وڵاتە هەژارنشینەکاندا، ژن و پیاو وەک یەک قوربانین. لەکاتێکدا ئەگەر وردتر تەماشا بکەین، دەبینین هەر لە منداڵییەوە تا گەورەبوون، ژن زۆر زیاتر ئازار دەچێژێت و زیاتر دەبێتە قوربانی. لە وڵاتە برسییەکاندا، لەبەر هەژاری منداڵەکانیان نانێرن بۆ خوێندن، ئەگەر بشینێرن زۆربەی کات کوڕەکانیان دەنێرن. چونکە کوڕ گرنگی زیاترە و کچ ماوەیەکیتر شوو دەکات و دەڕوات، بۆیە پێویست ناکات پارەی تێدا خەرج بکرێت. بە هەمان شێوەش لەبەر نەبوونی و هەژاری، کچەکانیان لە تەمەنێکی زۆر کەمدا دەدەن بە شوو.

ڕێگەم بدەن ئەم نایەکسانییە بە چەند نمونەیەک ڕوون بکەمەوە. دای مانجو کچێکی ١٣ ساڵ بوو لە گوندێکی دوورە دەستی چین. لە کوخێکدا دەژیا لەگەڵ دایک و باوک و دوو براو و پورە گەورەکەیدا. لە ناو کوخەکەدا بەرازێکیشیان ڕادەگرت. بەبێ بونی ئاو و کارەبا و هیچ هۆکارێکی ژیان. دای مانجو لە پۆلی شەشی سەرەتایی دەیخوێند و زیرەکترین خوێندکاری پۆلەکەشیان بوو. بەڵام خێزانەکەی لە خوێندن دەریان کرد و گوتیان، «ئەو ١٣ دۆلارەی کە دەیدەین بە کرێی خوێندنەکەی تۆ، بۆ ئێمە زۆرە. خۆ تۆ هەموو ژیانت لە کێڵگەدا بەسەر دەبەیت و خەریکی ئاوهێنان دەبیت. ئیدی بۆ ئەو پارە زۆرە لە تۆدا خەرج بکەین؟» لە ناوچە دورەدەستەکاندا کچان لەم دۆخەدا دەژین. کاتێک ئەم هەواڵە لە نیویۆرک تایمزدا بڵاو بوەوە، کۆمەکێکی زۆر کۆکرایەوە (کە زۆربەیان چەکی ١٣ دۆلاریی بوون) و نێردران بۆ خوێندنگەکەی ئەو گوندە. بەم جۆرە بەهۆی ئەو برە پارەیەوە، دەرفەت بۆ هەموو کچانی گوندەکە هاتە پێش تا بتوانن بچن بۆ قوتابخانە. دای مانجو توانی ناوەندی و دواناوەندی تەواو بکات و دواتریش ژمێریاری بخوێنێت و لە کۆتاییشدا کارێکی باشی لە باشور لە کوانگدۆنگ دەستبکەوێت. دواتر بۆ کار گەڕا بۆ هاوپۆل و هاوڕێکانیشی. پاشان پارەی ناردەوە بۆ خێزانەکەی. خێزانەکەی توانیان خانویەکی نوێ دروست بکەن کە ئاو و کارەبا و سەرجەم هۆکارەکانی ژیانی تێدابێت. دواتر توانی ژیانی سەرجەم گوندەکەی بگۆڕێت و کاری زیاتریان بۆ بکات و لە کۆتاییشدا جادە بۆ گوندەکەیان دروست بکات و گوندەکە ببەستێتەوە بە شارەوە. لێرەدا دەبینین کە ئەم کچە لە ڕێگەی خوێندنەوە، نەک خۆی، بەڵکو توانی ژیانی خێزانەکەی و هاوڕێکانی و گوندەکەی و خەڵکی ناو گوندەکەش بگۆڕێت.

لە ئەمریکا و ئەوروپادا، هۆکارەکانی ژیان بۆ ژن و پیاو یەکسانن. لە دابەشکردنی خواردن و دەرفەتی خوێندن و خزمەتگوزاری تەندروستیدا. بەڵام ئەمە بۆ هەموو شوێنەکانی دیکەی دونیا ڕاست نییە. بۆ نمونە تا ئێستاش کچ هەیە لەگەڵ لەدایکبونیدا لەناو دەبرێت. لە ئیسیوبیا چەندین کچ هەن کە لەبرسا دەمرن، یاخود لە سەنتەرەکانی نانپێداندا دەژین. لە کاتێدا لێکۆڵینەوە کراوە و دەرکەوتووە کە زۆربەیان

براکانیان بەو جۆرە نین و زۆر باش و تەندروستترن.

لە هیندستان، منداڵی تازە لەدایک بوو (واتە لە یەک ڕۆژەوە تا یەک ساڵ) کچ و کوڕ ڕێژەی مردنیان یەکسانە. چونکە لە یەکەم ساڵی تەمەندا منداڵ بە شیری دایک دەژی. بەڵام لە یەک ساڵ تا شەش ساڵ، ڕێژەی مردنی کچ ٪۵۰ زیاترە لە کوڕ. ئەمەش یەکێکە لە بەڵگەکانی جیاوازی دابەشکردنی خواردن لە نێوان ڕەگەزەکاندا. لە کتێبی نیوەی ئاسماندا هاتووە، باشترین ڕێگە بۆ بەرەنگاربونەوەی هەژاری و تیرۆریزم، بریتیە لە پەروەردەکردنی کچان. ئەمەش لەبەر سێ هۆکار باس کراوە.

هۆکاری یەکەم، یەکێک لە کێشە گەورەکانی دونیا بە گشتی و وڵاتە برسییەکان بە تایبەتی، زیادبونی ژمارەی دانیشتوانە. کاتێک تۆ ژنێک پەروەردە دەکەیت، ئەم ژنە دەزانێت چۆن بەرەنگاری ئەم کێشەیە ببێتەوە و ڕێگری لە زیادبونی منداڵەکانی بکات. لە کاتێکدا ئێستا ئەو هۆشیارییەیان نییە. لە وڵاتێکی وەک نەیجیریادا، یەک لەسەر حەوتی ژنان کاتی دوگیانی، پێشبینی مردنی منداڵەکانیان لێدەکرێت. بەشێکی زۆری هۆکاری پشت ئەمەش، نەبونی پەروەردەیەکی دروستە.

هۆکاری دووەم، کێشەی وڵاتە برسییەکان تەنها ئەوە نییە کە پارەیەکی زۆر کەم داهاتیانە، بەڵکو کێشەکە ئەوەیە کە ژیرانە ئەو داهاتە کەمەش خەرج ناکەن. چونکە بەداخەوە زۆربەی هەرە زۆری ئەو پارانە، پیاوان خەرجی دەکەن. زیاتر ٪۲۰ داهاتەکانیان، لەلایەن پیاوانەوە دەدرێن بە کحول و جگەرە و خواردنەوە گازییەکان و کاری لەشفرۆشی. لە کاتێکدا ئەگەر ئەم بڕە لە بواری پەروەردەدا خەرج بکرایە، دوای ماوەیەک گۆرانکاریەکی گەورە دەهاتە ئاراوە.

هۆکاری سێهەم، ژنان بەشێکن لە چارەسەر، نەک کێشەکان، وەک لە نمونەکەی دای مانجودا باسمانکرد کە چۆن خاتونێک دەتوانێت ژیانی خەڵکی گوندێک باشتر بکات.

لێرەدا با جیاوازیەک لە نێوان کۆیلایەتی سەدەکانی ناوەڕاست و ئەمڕۆدا بکەین. لە سەردەمی کۆیلایەتیدا لە کۆتایی ١٧٠٠ دا، نزیکەی ۸۰،۰۰۰ کۆیلە لە ئەفریقاوە گواسترانەوە بۆ وڵاتانی دیکە. بەڵام ئەمڕۆ دەرکەوتووە زیاتر لە ۸۰۰،۰۰۰ هاوڵاتی (تەنها بەڕێگەی نایاسایی) کۆچدەکەن بۆ ئەو وڵاتانە. من ئەمە ناو دەنێم (کۆیلایەتی مۆدێرن). نرخی کۆیلەکە لەوکاتەدا، نزیکی ٤۰،۰۰۰ دۆلار بوو بە پارەی ئێستا. بەڵام ئێستا دەتوانیت کچێک بهێنیت کارت بۆ بکات تەنها بە چەند دۆلارێکی کەم. لەم کۆیلایەتییە مۆدێرنەشدا دیسان مێینەیەکان پشکی شێریان بەردەکەوێت و هەموو دەزانین لە چ دۆخێکدان و چۆن دەستدرێژیان دەکرێتە سەر و لێ دەرێن و لاقە دەکرێن و دوگیان دەکرێن.

با چیرۆکی مەحبوبەتان بۆ بگێڕمەوە، مەحبوبە خەڵکی ئیسوپیایە و لە ١٣ ساڵیدا بێ ویستی خۆی بە زۆر دەیدەن بە شوو. کاتێک دوگیان دەبێت و کاتی منداڵبونی دێت، ڕادەکات بۆ ناو هەندێک گژوگیا تا لەوێ مندالەکەی ببێت. بەداخەوە لەوێدا منداڵەکەی گیان لەدەست دەدات و خۆشی بریندار دەبێت و

خوێنێکی زۆری لەبەردەڕوات و توشی دۆخێکی دەرونی تایبەت دەبێت و ناتوانێت کۆنترۆڵی هەموو فرمانەکانی لەشی خۆی بکات و بۆنێکی زۆر ناخۆشی لێدێت. خەڵکی گوندەکەش وادەزانن بەنەفرەت کراوە، بۆیە وەک دەستوری هەمیشەییان، لەناو کوخێکی دوور لە گوندەکە، زیندانی دەکەن. ئەو شەوە هەرچۆنێک بووە دەرگەی کوخەکە دەشکێنێت و دێتە دەرێ. دەزانێت ئەگەر بگاتە گوندەکەی دراوسێیان کە بنکەیەکی بیانییەکانی لێیە، ئەوا ڕزگاری دەبێت. بۆیە بە گاگۆڵکی ٣٠ میل دەبڕێت و بە نیوە مردویی دەگاتە ئەوێ. ئەوانیش دەیبەن بۆ نەخۆشخانە و چارەسەری دەکەن. دواتر کە تەندروستی باشتر دەبێت، پزیشکەکان سەرەنج دەدەن کە مەحبوبە کچێکی زۆر ژیرە. بۆیە دەیکەن بە پەرستار لای خۆیان. ئێستا مەحبوبە بەژدارە لە ڕزگارکردن و چارەسەرکردنی سەدەها و هەزارەها ژن لە وڵاتەکەی خۆیدا. دیسان ژن بوو بە بەشێک لە چارەسەر، نەک کێشە.

کاتێک کچێک دەنێریتە بەر پەروەردە و خوێندن، ژنێکی خوێنەوار دەردەچێت و دواتریش کە هاوسەرگیری کرد، منداڵی کەمتر دێنێتە دونیاوە. دواتر دەشزانێت چۆن ئەو منداڵە کەمانە پەروەردە بکاتەوە.

با باسی سایمەتان بۆ بکەم، سایمە خەلکی پاکستانە و ژنی ماڵەوە بوو و هەموو ڕۆژێکیش لەلایەن مێردە بێکارەکەیەوە لێی دەدرا. کاتێک کچی دوەمی بوو، ئیدی بەردەوام خەسوی بە مێردەکەی دەگوت، «کوڕم ژنێکی دیکە بهێنە، ئەم ژنە کوڕت بۆ دروست ناکات.»

لەم کاتانەدا، ڕێکخراوێکی خێرخوازی، بری ٦٥ دۆلار بە قەرز دەدەن بە سایمە تا کاری پێبکات. سایمەش دەست دەکات بە کاری دروستکرنی نەخش و گوڵ و ڕەنگ و نوسینی سەر قوماش. بازرگانەکان کارەکانی ئەویان زۆر پێ جوان دەبێت، چونکە زۆر باش دەفرۆشرا، بۆیە داوای زیاتریان لێکرد. ئەویش بەتەنها فریای دروستکردنی ئەو هەموو نەخشە نەدەکەوت. بۆیە چەند ژنێکی دیکەی گوندەکەی لای خۆی دانا و ئەوانیش دەستبەکار بوون. پاش ماوەیەک، توانی لای خۆی کار بۆ ٣٠ ژنی گوندەکە دابین بکات. دواتر پێویستی بە کەسێک بوو ئەو هەموو بەرهەمەی لە گوندەکەوە بۆ ببات بۆ بازاڕەکان. بۆیە هەستا ئەو کارەی بە مێردەکەی سپارد، ئێستا مێردەکەشی لای ئەو کاردەکات و پارە لەم وەردەگرێت. بەم دواییە سێهەم کچیشیان هاتە دونیاوە. سایمە هەر سێ کچەکەشی ناردووە بۆ خوێندن، چونکە دەزانێت چی گرنگە بۆ منداڵەکانی.

چیرۆکێکی جیاوازتر لەوانەی دیکە، خاتوو گریسێلدا، منداڵی خێزانێکی هەژارە. خێزانەکەی دەیانویست بینێرن بۆ خوێندنگە و هەموو زەمینەیەکیان بۆ ڕەخساند و خواردن و خەرجی خۆیان کەمکردەوە تا کچەکەیان بنێرن بۆ خوێندنگە. بەڵام کاتی ڕۆشتن بۆ قوتابخانە، کۆمەڵێک پیاو بە زۆر دەیفڕێنن و بە زۆر بە هەموویان لاقەی دەکەین. لەو ڕۆژەوە ئەو خاتوونە خۆی لە سوچێکی ماڵەکەدا دیل کردووە و ناچێتە دەرەوە و نایەوێت کەس ببینێت. کەواتە هەبوونی پارەش هەموو شتێک نییە، دابینکردنی ئاسایشیش پێویستە. لاقە کردن لە یاسای هەموو ئەو وڵاتانەدا قەدەغەیە، بەڵام پەیڕەو ناکرێت و یاسایەک نییە

لێپێچینەوە بکات. نەبونی یاساش بەشێکی گەورەی ئەوکارەساتانەن کە بەسەریان دێت. ڕۆژانە بەبەرچاوی هەموو دونیادا خاتونەکان ڕەجم دەکرێن و تێزابیان پێدا دەکرێت و کچی تازە لەدایک بوو فڕی دەدرێت. ئێمە و میدیاکان و تەواوی دونیاش چاو و دەم و گوێی خۆمانمان لێ خەواندووە. تا ئێستا ئەگەر ژنێک لەئەفغانستان مێردەکەی شکاتی لێبکات و بڵێت ژنەکەم تۆراوە و بێ پرسی من چوەتەوە ماڵی باوکی، بە پێی پاسا دەیگرن و لوتی یان گوێی دەبڕن. تا ئیستا زۆر بە سانایی، بەبەرچاوی سەرجەم یاساکانی دونیاوە، لە پاکستان و ئەفغانستان لەسەر شەقامەکان تێزاب و ئەسید دەکرێت بە ژنان و کچاندا و هەموو ڕوخسار و جەستەیان دەشێوێنرێت و هەموو یاساکانیش بێباکن.

خاتو شێرلی دوای ئەوەی ئەم چیرۆکانەی بۆگێراینەوە، گوتی، «گەورەترین و دیارترین غەدر و زوڵم و زۆر کە لە سەدەی نۆزدەدا هەبوو(کۆیلایەتی) بوو. لە سەدەی بیستدا (تۆتالیتاریزم) بوو، لەم سەدەیەی ئێستاماندا (جیاوازی ڕەگەز)ە، کە بێگومان مەبەستم ئەو زۆرداری و ئەشکەنجەیە کە لە سەرانسەری دونیا ژن و کچ بەرەوڕووی دەبنەوە.»

(نیوەی ئاسمان) ناوی کتێبێکە لە نوسینی شێرلی و نیکۆلای و ناوەکەی کورتکراوەی (ژنان نیوەی ئاسمانیان هەڵگرتووە)یە.

یەکێک بووە لە کتێبە باشەکانی چەند ساڵی ڕابردوو و چەندین چیرۆکی هاوشێوەی ئەوانەی سەرەوەی تێدایە.

## پێنج

زۆر گرنگە هەست بەو پەیوەندییە بکەین کە هەر تاکێکی ئێمەی مرۆڤ پێکەوە دەبەستیتەوە. لەمەش زیاتر، درک بە هەموو ئەو پەیوەندیانەی ژینگە و هەموو بونەوەرانی دیکە و مرۆڤ پێکەوە دەبەستنەوە. ڕەنگە ئەو کارەی تۆ دەیکەیت، خۆت ئەنجامەکەی نەبینیت. ڕەنگە ئەو کارەی لە ئیستادا بۆ مرۆڤایەتی دەکەیت، لە چاودێریکردن و ڕواندنی سەوزایی درەخت بێت یاخود هاوکاری کردنی هەژاران یاخود هەرچ جۆرێکی دیکەی پاراستنی مرۆڤایەتی، خۆت بەرهەمەکەی نەبینیت. بەڵام دواجار ئەم کارە گۆڕانکاری دەکات لە ژینگەدا یاخود لە ناو ژیانی ئەو خیزانە هەژارەدا کە یارمەتیت بۆ ناردن. سەبارەت بەو پەیوەندییە بەهێزەی لە نێوان مرۆڤەکاندا هەیە، جاکویلین نۆڤۆگراتز دەگێڕێتەوە، «یازدە ساڵ بووم کاتێک مامم قەمسەڵەیەکی بۆ کڕیم. لە پێشەوە وێنەی هەندێک ئاژەڵی کێوی پێوە بوو. هێندەم خۆشدەویست بۆ هەموو شوێنێک لەبەرم دەکرد. بەنرخترین شتی هەموو ژیانم بوو تا ئەوکاتە هەمبوبێت. ڕۆژێک هاوڕێکانم لە قوتابخانە گاڵتەیان پێکردم چونکە قەمسەڵەکەم وێنەی ئاژەڵی تێدا بوو. ئیدی کە ڕۆشتمەوە، بە گریانەوە بە دایکمم گوت کە چیتر ئەو قەمسەڵەیە لەبەرناکەمەوە. بۆیە ڕۆژێک ناردمان بۆ گروپێکی خێرخواز. دوای

یازده ساڵ کە چوم بۆ ڕواندا، منداڵێکم بینی قەمسەڵەیەکی لەبەردا بوو، لە هەمان قەمسەڵە کۆنەکەی خۆم دەچوو. بڕوام نەدەکرد هەمان ئەوەی خۆمبێت. چووم بۆ لای منداڵەکە و کردمە باوەش و سەیری ژێر ملیوانی قەمسەڵەکەیم کرد، ناوی خۆمم بینی. لەوکاتەدابوو درکم بە پەیوەندی نەبڕاوە و لێکدانەبڕاوی نێوان مرۆڤەکان کرد.»[٥]

ئەندریو یۆنگ دوای ئەوەی کە بۆ ماوەی ١٠ ساڵ لە ئەفریقا کاری کرد، بۆی گێڕاینەوە، «کە سەرەتا چومە ئەفریقا، خێزانێکی جوتیار بانگێشتیان کردم تا شەو لای ئەوان بمێنمەوە. کۆمەڵێک مرۆڤی بێ ئەندازە جوان بوون! شەو هەموو پێکەوە قسەی خۆشمان کرد و گۆرانیمان گوت. دواتر بەتانیەکیان پێدام و لەسەر زەوییەکە خەوتم. بۆ بەیانی کە هەستاین، بۆ ژەمی بەیانی هیچیان نەبوو بۆ خواردن. بۆ نیوەڕۆ کچە گەورەکەیان هەستا و شۆربایەکی لێنا و هەر منداڵێک و یەک کوپ شۆربایان وەرگرت و خواریانەوە، تەنها بۆ ئەوەی لە برسا نەمرن. ناتوانم بۆتان باس بکەم کە هەستم بە چ شەرمەزارییەک کرد. ئەوان بۆ ئەوە نان ناخۆن تا تێربن یاخود چێژی لێ ببینن، بەڵکو تەنها بەشی ئەوە خواردنیان هەیە کە لەبرسا نەمرن و چالاکیەکانی مێشکیان نەوەستێت.»[٦]

بۆ ئێمە نانمان هەیە و ئەوان نیانە؟ بۆ ئێمە منداڵەکانمان برسی نین و ئەوان برسین؟ بۆ ئێمە و منداڵەکانمان تەندروستن و ئەوانیش لە سەرەتاییترین خزمەتگوزارییە تەندروستیەکان بێبەشبن؟ ساڵانە ٨٨١،٠٠٠ کەس لە دونیادا بە نەخۆشی مەلاریا دەمرن. ٪٩١ ی ئەو ڕێژەیە لە ئەفریقان. ٪٨٥ ی ئەو ڕێژەیە منداڵی خوار تەمەن ٥ ساڵانن.

چەند هەوڵێکی تاکەکەسی هەن، کە توانیویانە گۆڕانگاری گەورە ئەنجام بدەن. بەخۆشحاڵییەوە ئەو هەوڵانە لە وڵاتی خۆشماندا هەن و بەردەوامییان هەیە. یەکێک لەو هەوڵانە، ئەنجامدانی کەمپین و چالاکییە جۆراوجۆرەکانە. لە کوردستانـدا چەندین کەمپینی گرنگ ئەنجامدراون بۆ کۆکردنەوەی کۆمەک و پێداویستی بۆ ئاوارەکان و ئەو ناوچانەی جەنگ وێرانی کردون و بۆ خەڵکی چەندین کورتە فیلم و ڤیدیۆ و پیشانگای فۆتۆ و تابلۆ کراونەتەوە لە بارەی پاراستنی ژینگە و هاوکاریکردنی ئاوارەکان و یاخود بۆ ڕواندنی نەمام. ساڵانە چەندین کتێب چاپدەکرێت و داهاتەکەی بۆ نەخۆشخانەی هیوا دەنێردرێت کە تایبەتە بە شێرپەنجە. (خۆشبەختانە ئەم کتێبەی ئێمەش یەکێکە لەو کتێبانە.) چەندین کۆنسێرت دەکرێت کە داهاتەکانیان بۆ هەمان نەخۆشخانە دەڕۆن. ئەمانە هەموو هەوڵی تاکە کەسین کە دەکرێت هەر کەس لە ئێمە بتوانین ئەنجامی بدەین و کاریگەری پێ دروست بکەین.

یەکێک لەو کەمپینانەی کە لە ئەوروپا سەبارەت بە ژینگە کرا و من دەمەوێت لێرەدا وەک نمونە باسی بکەم، کەمپینێکی زانکۆی (St Andrews)ی سکۆتلەندییە. چەند خوێندکارێکی ئەو زانکۆیە کورتە فیلمێکیان بەرهەم هێناوە و لە ناویدا چەند داتایەکی مەترسیدار باس دەکەن،

«بۆ کۆمپانیای دێل و ئەپڵ و ئێچ پی، نامەیەک لە چەند خوێندکارێکی کڕیارتانەوە لە زانکۆی ست ئەندریوسـەوە.

کۆمپانیای بەڕێز، ڕەنگە تۆ من نەناسیت، بەڵام من یەکێکم لە کڕیارەکانی بەرهەمەکانت. زۆرم پێخۆشە بەرهەمانت بەکاربهێنم. بەڵام کێشەیەک هەیە. لە ساڵی ١٩٩٨-ەوە زیاتر لە ٦ ملیۆن هاوڵاتی لە کۆنگۆ گیانیان لەدەست داوە و بونەتە قوربانی، لە لایەن گروپێک چەکدارەوە. هەروەها ژن و کچەکانیان لاقە کراون. ئەم هاوڵاتییە لەلایەن میلیشیا چەکدارەکانەوە، بە زۆر ناچاری کارکردن کراون و بەردەوام کاریان پێدەکەن لەکێڵگە و تونێلەکانی گەڕاندا بە شوێن ئەم مادەیەدا.

ئەم مادەیە ناوی Conflict-Minerals -ە و لە بنەڕەتدا لە چوار مادەی دیکە پێکهاتووە. بەکارهێنانی ئەم مادەیە لە بەرهەمە ئەلکترۆنیەکاندا، بوەتە هۆی سەرهەڵدانی ئەو کارەساتە گەورەیە لە کۆنگۆ. من نامەوێت، کۆمپیوتەر و ئایپاد و مۆبایلەکەم، لەم مادەیە دروست بکرێت. نامەوێت ئەم جۆرە بەرهەمانە لە کۆنگۆوە بهێنرێتە ناو وڵاتەکەمەوە. ئەم جۆرە مادانە کارەساتی گەورەیان دروست کردووە، ئێستا کاتی ئەوەیە بەرەنگاریان بوەستینەوە، ئێستا. وەک کڕیارێک داواتان لێدەکەم کە چیتر بەرهەمەکانتان لەم جۆرە ماددانە بەرهەم نەهێنن کە لەم جۆرە وڵاتانەوە دین. دەمەوێت دڵنیابم لە کاتی نوسینی لاپەرەیەکدا یاخود لە کاتی خوێندنەوەی تێکستێکدا بۆ پۆلەکەم، یاخود کاتێک پەیوەندی بە هاوڕێیەکمەوە دەکەم یاخود تەماشای ڤیدیۆیەک دەکەم لە یوتوب، دەمەوێت دڵنیابم کە بەشێک نەبووم لەو کارەساتەی بەسەر وڵاتێکی وەک کۆنگۆدا دێت. بەڵێنیشتان دەدەمێ، ئەگەر کۆمپانیاکەتان لەم جۆرە کارە قێزەونانە خۆت بە دورگرت، ئەوا من یەکەمین کڕیاری کاڵاکانتان دەبم. بەڵام تا ئەو کاتە، لە ئاگادارکردنەوەی ئەوانی دیکە ناوەستم بەرامبەر کارەساتی بەکارهێنانی ئەم جۆرە ماددانە، لە زۆرلێکردنی دەسەڵاتدارانی وڵاتەکەم ناوەستم بەرامبەر هەڵوێست وەرگرتنیان بەرامبەر بەم جۆرە مادانە. لە داواکردنی یەکسانیش ناوەستم بۆ کۆنگۆ. تکایە هیوایەکی زیاتر ببەخشن بە کۆنگۆ. سوپاس بۆ گوێگرتنتان. چاوەڕێی وەڵامتانم.»

ئەمە هەوڵی کۆمەڵێک خوێندکارە، توانیویانە لە ڤیدیۆیەکی کورتی کەمتر لە سێ خولەکدا لە مەترسییەکی گەورە ئاگادارمان بکەنەوە و زانیارییەکمان پێبڵێن کە بۆ زۆربەمان نوێ بوو. ئەم جۆرە کارانە یەکێکن لەو جۆرە هەوڵانەی کە هەر تاکێکمان دەتوانین کاری هاوشێوە بکەین.

یەکێکی دیکە لە هەوڵە تاکە کەسییە گرنگەکان کە زۆر کەس لە دونیادا پەیڕەوی دەکەن بۆ زیاتر پاراستنی ژینگە، بەرنامەیەکە پێی دەوترێت (بەفیڕۆدانی سفر یاخود خاشاکی سفر). با ڕێگە بە خاتوو لاورین سینگەر بدەین خۆی بۆمان باسبکات ئەم بەرنامەیە چییە و سودی چییە.

«ئەوە بۆ چەند ساڵێک دەبێت من بڕیاری ئەوەم داوە ببم بە (بەفیڕۆدانی سفر). بەفیڕۆدانی سفر واتە لە ماڵەوە هیچ جۆرە خاشاک و زبڵێکت نەبێت. بە تایبەتی مادەی پلاستیک، چونکە یەکێکە لە مەترسیدارتین

ماددەیە بۆ ژینگە. کاتێک لە زبڵدانیماڵەکەم وردبومەوە، بینیم بەشێکی زۆری خاشاکەکانم پلاستیکن. بۆیە بڕیارمدا چیتر هیچ شتێک نەکڕم پلاستیکی تێدا بەکارهاتبێت. ئەمە کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە کاتێک دەچومە بازاڕ و مارکێتەکان تا پێداویستی و خۆراکەکان بکڕم، هەمیشە هەموو خواردنەکان لە پلاستیکدا پێچرابونەوە و خاوەن دوکانەکەش بۆی دەکردمە زەرفێکی نایلۆنەوە.

ئێستا فێربومە چۆن خۆم هەموو پێداویستیەکانی خۆم دروست بکەم، بەجۆرێک خاشاکم نەبێت. بۆ نمونە، فڵچە و مەعجونی ددان شۆردنەکەم لە پلاستیک بوو، ئێستا چیتر نایانکڕم و لە سۆدەی چێشتلێنان مەعجون دروست دەکەم. یاخود کاتێک دەچووم بۆ بازاڕ خواردەمەنی و پێداویستیەکانی ڕۆژانەم بکڕم، بەشێکی زۆری پێداویستەکان بە پلاستیک پێچرابونەوە و بە پلاستیک داپۆشرابوون. یاخود زۆر خواردەمەنیم دەبینی لە ناو قوتوی پلاستیکدابوون. لە دواجاریشدا کە دەتکڕین، خاوەنی فرۆژگەکە سەرجەم شتەکانتی دەکردە عەلاگەیەکەوە بۆت، کە دیسان عەلاگەش پلاستیکە. بۆیە من بیرم لەوە کردەوە کە لەگەڵ خۆم، سەبەتەیەک یاخود زەمیلەکەک ببەم و ڕاستەوخۆ دەچوم بۆ فرۆژگەی جوتیارەکان خۆیان، چونکە شتەکان لەوێ هەمیشە نوێ و فرێشن. لەوێ سەوزە و میوەکەم دەکێشا، ڕاستەوخۆ دەیانکەمە ناو ئەو شتانەی خۆمەوە کە بردبوومن، بێ ئەوەی عەلاگە بەکاربهێنم. هەمان شتم دەکرد بۆ هەموو بەرهەمەکانی دیکەش.

بە تێپەڕبونی کات، فێربووم کە خۆم سەرجەم ئەو شتانە دروست بکەم کە بەکاریان دێنم. کاتێک شتێک دەشکێت، فڕێی نادەم، بەڵکو چاکی دەکەمەوە.

یەکێکی دیکە لەو ڕێگەیانەی گرتومەتە بەر، کڕین و بەکارهێنانی شتی دەستی دووە. بەمجۆرە من هەم بەرهەمێکی لەکارکەوتوو بەکاردێنمەوە، هەمیش خۆم لە کڕینی شتێکی نوێ بەدوور دەگرم و ناهێڵم بەرهەمێکی نوێ بە هۆی منەوە بەرهەمبێت و دواتر زبڵدانەکان گەورەتر بکات.

یەکێکی دیکە لەو سودانەی کە بەدەستم هێنا، کەمبونەوەی ئەو شتانەیە کە بەکاریان دێنم. چونکە ئێستا تەنها ئەو شتانەم هەن کە زۆر پێویستن. قەرەباڵغی لە ماڵەکەمدا کەمتر بووەوە و ماڵەکەم گەورەتر بووە و سەرم سوکتر بووە. لەبەر ئەوەی کە لە ماڵەوە شتم کەمتر هەیە، پاککردنەوەی ماڵەکەشم ئاسانتر بووە و کاتی کەمتر دەوێت.

دەزانم، ڕەنگە وادیاربێت ئەم جۆرە ژیانە زۆر قورسە. بەڵام دڵنیاتان دەکەمەوە بەو جۆرە قورس نیە کە دەردەکەوێت. ئەو شتانەی کە بەدەستی دێنن، زۆر زیاترن لەو شتانەی کە لەدەستی دەدەن.

لەبەر ئەوەی کە خۆم پێداویستیەکان دەکڕم و لەماڵەوە خۆراک دروست دەکەم.

بە هۆی کڕینی شتی دەستی دووەوە، پارەیەکی زیاترم بۆ دەگەڕێتەوە. چونکە وەک ئاشکرایە، شتی دەستی دوو هەمیشە هەرزانترە. ئەمەش یەکێکە لەو شتە باشانەی کە بەدەستم هێناوە. لەبەر ئەوەش کە ماڵەکەم سادەبوەتەوە و تەنها ئەو شتانەم هەیە کە پێویستم پێیەتی و شتی زیادەم نییە، کەمتر دەچم بۆ

بازاڕ و پێداویستیم کەمتر دەوێت، لەبەر ئەمە کاتێکی زیاتریشم بۆ دەگەڕێتەوە. زیادبونی کاتیش سودێکی دیکەبوو کە بەدەستم هێنا.

یەکێکیتر لەو سودانەی کە لەم شێوازە ژیانکردنەدا بەدەستم هێنا، باشتر و باشتربونی تەندروستیمە. چونکە هەموو خواردنەکانم فرێش و نوێن و لە خۆراکی بازاڕ و سەفەری و خواردنی قوتو خاوێنترن. ئەو خواردنەشی کە خۆم بۆ خۆمی دروست دەکەم، بە شێوەیەکی زۆر خاوێن دروستی دەکەم و ماددەی پارێزەر (مواد حافظة)ی تێناکەم کە لە خوارنەکاتی دەرەوەدا هەیە و زۆریش مادەیەکی خراپە. ئەو ترس و دڵەڕاوکێیەشم نەما کە ئایا تۆ بڵێی ئەو چێشتخانەیەی نانی لێ دەخۆم پاکوخاوێن بێت، بڵێیت چێشتلێنەرەکان دەستیان بشۆن و بە خاوێنی ئیشەکانیان بکەن؟ چیتر خۆم بە تەندروستترین شێوە لێی دەنێم و ئەو دڕدۆنکیەم نییە.

کاتێک تۆ دەچیت بۆ چێشتخانەیەک یاخود بۆ مارکێتێک خۆراکێک دەکڕیت. کاتی خواردنی بە خۆت دەڵێیت، «خواردنێکی خۆش بوو بەڵام خۆزگە خوێی کەمتر تێدابوایە، یاخود خۆزگە خوێی زیاد بوایە ، یاخود بە خۆی دەڵێیت، بریا پیازی تێدا نەبوایە، بریا سیری تێدا نەبوایە، زۆر خۆشە بەڵام خۆزگە هێندە شیرین نەدەبوو، یاخود خۆزگە فڵانە شتی تێدا نەبوایە یان فڵانە شتی تێدابوایە، بریا زیاتر بکوڵایە، بریا کەمتر لەسەر ئاگر بوایە.» یاخود خواردنێک هەیە تۆ حەزت لە تامەکەی یاخود ڕەنگەکەی یان بۆنەکەی نییە. بەڵام من ئەو کێشانەی ئێوەم نییە. چونکە من خۆم خواردنی خۆم دروست دەکەم، هەرچۆن پێمخۆشبێت وای لێدەکەم، چی حەزم لێی بێت تێی دەکەم و چیم پێ خۆش نەبێت تێی ناکەم. ڕەنگ و تام و بۆنیش بەدەست خۆمە، بەڵام ئێوە وانیین.

یەکێکیتر لە سودەکانی دیکەی ئەم شێوازەژیانکردنە، بە هەمان شێوەی تەندروستیم، کێشیشم جێگیر بووە. ئێستا کێشی زیادەم نییە. چونکە خۆراکەکانم خاوێنن و هیچ مادەیەکی زیادەی تێناکەم بۆ چەوری لەش خراپبێت، وەک سۆدە، ڕۆن، خوێ و شەکر و هەرچ شتێکی دیکە. ئێستا زۆر ڕەشیقم و کێشم جێگیرە. بەهۆی باشی تەندروستیم و نەبونی چەورەی زیادە و کێشی زیادە لە لەشما، ئێستا زۆر چالاکترم. هێز و توانام زیاترە و پێویستم بە خەوی کەمترە و گورجوگۆڵتریشم.

کاتێکیش خواردنی تەندروست دەخۆیت و کێش و چەوری زیادە لەلەشتدا نییە و پارەیەکی زۆرت بۆ گەڕاوەتەوە، هەموو ئەمانە وادەکەن کە دڵخۆشتربیت.

لە سەروو هەموو ئەمانەشەوە، من کەسێکم زبڵ و خاشاک بەرهەم ناهێنم، بە تایبەتی پلاستیک. وەک ئاشکرایە لە ئێستادا خاشاک یەکێکە لە کێشە هەرە گەورەکان. داتاکان دەریان خستووە کە هەر هاوڵاتیەکی ئەمریکی لە ڕۆژێکدا ٤،٤ پاوەن خاشاک بەرهەم دێنێت. ئەمەش ڕێژەیەکی زۆر زۆرە و شایەنی هەڵوێست وەرگرتنە.

کاتێک دەبیت بەکەسێکی (بەفیڕۆدانی سفر) دەتوانیت تەواو تەواو کۆنترۆڵی ئەو شتانە بکەیت کە دێنە لەشتەوە، بەڵام خەڵکانی دیکە وانین. ئەوە خاوەنی کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنان و چێشتخانەکانن بڕیاردەدەن چ خۆراکێک بێتە جەستەتەوە و چۆنیش بێت. بێگومان من بۆم نییە بە ئێوە بڵێم چۆن بژین و چی بکەن و چی نەکەن. تەنها داواتان لێدەکەم کەمێک زیاتر بیر لە ژینگە بکەنەوە.»

با بیر لەوە بکەینەوە کە ئەگەر ژمارەی ئەو کەسانەی ئەم جۆرە ژیانە پەیڕەو دەکەن زۆربێت، چەندە ژینگە پاکتر دەبێتەوە.[٧]

جۆرێکیتر لە هەوڵدانی تاکە کەسی هەیە کە بۆ چەندین ساڵە لە هەموو دونیادا خەڵکانێکی زۆر پەیڕەوی دەکەن، (ڕووەکخۆریی)یە. ئاشکرایە کە کەسانی ڕوەکی، بە هیچ جۆرێک گۆشت ناخۆن، چونکە ئەم کەسانە درکیان بە مەترسی خواردنی گۆشت کردووە. با چەند مەترسییەکی خواردنی گۆشت بخەینە ڕوو.

بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی وێبسایتی ئەنیمێڵ ئیکوالیتی، ساڵانە نزیکی ٥٦ ملیار ئاژەڵ لە کوشتارگەکاندا سەردەبڕدرێن. بێجگە لە ماسی و ئاژەڵە ئاوییەکانی دیکە. واتە لە هەر ساڵێکدا ڕوح لە ٥٦ ملیار بوونەوەر دەسەندرێتەوە، بە هۆی ئێمەوە کە گۆشت دەخۆین. بەڵام بەهۆی هەر کەسێکی ڕوەکییەوە ساڵی نزیکەی ٩٥ ئاژەڵ کەمتر سەردەبڕدرێن لە دونیادا. کەسە ڕوەکییەکان درکیان بەو تاوانانە کردووە کە بەرامبەر ئاژەڵەکان ئەنجام دەدرێن، بۆیە ئەم ڕێگەیەیان هەڵبژاردووە و بە هۆی ئەوانەوە ساڵانە ئەو ڕێژە زۆرە ڕوح ڕزگار دەکرێت.

بەڵام ئەمە هەموو هۆکارەکانی پشتی هەڵبژاردنی ڕوەکی نین، بەڵکو داتاکان کۆمەڵێک شتی زۆر مەترسیدارترمان پێدەڵێن.

بۆ بەدەستهێنانی یەک کیلۆ پەتاتە لە کێڵگەیەکدا، پێویستمان بە سەد لیتر ئاوە. بۆ بەدەستهێنانی یەک کیلۆ برنج، پێویستمان بە چوار هەزار لیتر ئاو هەیە. لەکاتێکدا بۆ دەستکەوتنی هەر کیلۆ گۆشتی ئاژەڵ، پێویستمان بە سیازدە هەزار لیتر ئاو هەیە. ئەمە بێجگە لە خەرجی هۆکارەکانی گواستنەوە و گاز و مەکینەی ناو کارگەکان. باشە نەخواردنی گۆشت چ سودێک بە هەژاران دەگەیەنێت؟ ڕوەکیەکان بیر لەوە دەکەنەوە کە ئەگەر ئەم هەموو خەرجییە لە بەرهەمە کشتوکاڵییەکاندا بکرێت ئەو هەموو ئاوە لە کشتوکاڵدا بەکاربهێنرێت، زۆر ئاسان دەتوانین خۆراک بەشی هەموو دونیا دابین بکەین. لەگەڵ ئەوەشدا کە لە زۆر وڵات، بە هۆی کەمی ئاوەوە، هەر ژنێک دەبێت ڕۆژانە چەندین کیلۆمەتر بە پێ ببڕێت بۆ پەیداکردنی سەتڵێک ئاو. سەرەڕای ئەوەش لە زۆر وڵات ئاوەکە پیسە و بۆ خواردنەوە ناشێت. لە دونیادا ڕۆژی ٥،٠٠٠ کەس بە هۆی نەبونی ئاوی پاکەوە گیان لەدەست دەدەن. لەوێ مرۆڤگەلێک بەهۆی نەبونی ئاوەوە گیان دەسپێرن. ئەمانیش لێرە ئەو هەموو ئاوە زۆرە بەفیڕۆ دەدەن، بۆیە ڕوەکییان هەڵبژاردووە.

هەموو ئەمانە بێجگە لەوەی کە زیاتر ٪ ٥٠ ی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان دەدرێن بە ئاژەڵان وەک ئالیک،

تا دواتر سەریانببڕن و گۆشتەکەیان بفرۆشن. ڕوەکیەکان بیرلەوە دەکەنەوە کە ئەو ٪٥٠ کشتوکاڵە، ئەگەر بدرێت بە ئەفریقا، زۆر بە سانایی دەتوانرێت برسیەتی بوەستێنرێت.

لەساڵی ١٩٥٠ بە دواوە، داواکاری لەسەر خواردنی گۆشتە ئاوییەکان پێنج هێندە زیادی کردووە. داواکاری لە ١٨ ملیۆن تەنەوە، زیادی کردووە بۆ ١٠٠ ملیۆن تەن. سەدەها کارگەی گەورەی سەرمایەدار، بە خۆیان و کەشتییە زەبەلاحەکانیانەوە، خەریکە دەریا لە سەرجەم ئاژەڵە ئاوییەکان بەتاڵدەکەن. ئەمەش مەترسی بۆ ماسییە گەورەکان و چەندین جۆر باڵندە و پەنگوین و سەگی دەریا و چەندین ئاژەڵ دروست کردووە کە لەسەر خۆراکی ماسی دەژین. ڕەنگە کەسانێک هەبێت بڵێن ئەگەر ئێمەش نەیانخۆین، خۆیان یەکتر دەخۆن. بێگومان ئەمە ڕاستە. بەڵام مرۆڤ یاساکان دەشێوێنێت. مرۆڤ بە خواردنی گۆشت، ١٠٠٠ جار کوشتنی ئاژەڵەکانی خێراتر کردووە لە ژمارە سروشتیەکەی خۆی.

هۆکارەکانی گواستنەوە، پیشەسازی، بڕینەوەی دارستانەکان، ئەمانە بونەتە هۆی پیسبونی هەوا و گەرمبونی زەوی و توانەوەی بەستەڵەکەکان. لە ٤٠ ساڵی ڕابردودا، بە ڕێژەی ٪٤٠ شاخەکان تواونەتەوە. گەر نەوەستین و بەردەوامبین، لە ٢٠٣٠ سەرجەم شاخەکان دەتوێنەوە. ساڵانە ١٣ ملیۆن هێکتار لە دارستانەکان دیارنامێنن، دەسوتێن یاخود درەختەکان لەلایەن کۆمپانیاکانی دروستکردنی کاغەز و تەختەوە دەبڕدرێنەوە. کێشەیەکی دیکە چۆڵبونی گوندەکان و کۆچی دانیشتوانەکانیانە بۆ شارەکان. ئەمەش دیسان کەسی بەرهەمهین کەمدەکات و ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان دەخاتە مەترسییەوە.

هەڵبەتە ئەوەی کە لێرەدا سەبارەت بە چارەسەرکردنی هەژاری باسکرا، بەشێکی زۆریان چارەسەری کاتی و کورتخایەن بوون. ئەو وڵاتە برسییانە ناتوانن تا ئەبەد بە هاوکاری بچوکی ئێمە بژین. ئێمە دەتوانین تا ئەوکاتە هاوکاریانبین کە دەکەونە سەر پێی خۆیان. چونکە وڵاتانی ئەفریقا، وڵاتانێکی برسی نین، بەڵکو ئەوە ئێمەین لە هەموولایەکەوە بەرهەمەکانیان لێ داگیر دەکەین ودەیبەین بۆ خۆمان، لە نەوت و ئەڵماس و چەندین مادەی کانزایی دیکە. ئەم هاوکاری و هەوڵانەی ئێمە تا ئەوکاتە بەردەوام دەبن کە کۆمپانیا سەرمایەدارەکان بەخۆیاندا دەچنەوە، یاخود یاسایەک دروست دەبێت و دەیانوەستێنێ یاخود کارەکانیان سنوردار دەکات. ئەگەر کۆمپانیا سەرمایەدارەکان بەپێی پێویست کاریان بکردبا و ڕەچاوی ژینگە و مرۆڤایەتیان بکردایە و زیادەڕۆییان لە بەرهەمهێناندا نەکردایە، ڕێژەی هەژاریی بەم جۆرەی ئێستا لەو هەڵکشانە مەترسیدارەدا نەدەبوو. یاخود ئەگەر ئەو وڵاتانە سەرۆکی باشیان هەبوبا، ئەو سەرۆکە دەیتوانی کار بە داهاتی ناوخۆی وڵات بکات و کارێک بکات دۆخی ژیانیان زۆر لە ئێستا باشتربێت. بەڵام تا ئەوکاتەی ئەم شتانە ڕودەدەن و گوزەرانیان باشتر دەبێت. لە ئێستادا ٧/١ یەک لەسەرحەوتی دانیشتوانی سەرزەوی لە هەژاریدا دەژین. ٪٥٠ ی داهاتی زەوی، بە دەستی ٪٢ ی دانیشتوانەوەیە. ئەو ڕێژە کەمە لە خەڵکی، دەستیان بەسەر ئەو هەموو داهاتەدا گرتووە، کە بێ گومان موڵکی هەموانە نەک تەنها ئەوان. بەهەمان شێوە ٪٢٠ی بەرهەمەکانی سەر زەوی، بۆ ٪ ٨٠ی مرۆڤەکانە و ٪٨٠ ی بەرهەمەکانی دیکەش

بۆ ٢٠٪ ی دانیشتوانە. تا ئەم هەژارییە بەردەوامبێت دەبێت ئێمە بەردەوامبین لە یارمەتیدانی سەرجەم مرۆڤایەتی. چونکە لەم سەرزەوییە، خۆراک بەشی هەموومان هەیە. تەنها پێویستمان بەوەیە فێرببین لە ناو خۆماندا بەشی بکەین. هیچ شتێک راستەقینەتر نییە لە هەژاری. هەرچ ڕۆژێک درەنگتر دەستبکەین بە کارکردن بۆ بنەبڕکردنی برسێتی، ئەوا لەو ڕۆژەدا هەزارەها کەس گیانیان لەدەستداوە. با ئێستا و لێرەوە دەستبەکاربین.

زۆر بە کورتی دەمەوێت ئاماژەیەک بە هەموو ئەو خواردنانە بدەم کە ڕۆژانە فڕێدەدرێن. لێرەدا داتایەکی تەواوم لەبەردەستدا نییە، بەڵام ئاشکرایە و ڕۆژانە هەموو دەیبینین کە چەندە خواردن لە ماڵ و ڕیستۆرانت و سەیرانگاکاندا فڕێ دەدرێت. بێجگە لەوەی هەموو ئەو خۆراکانە بەفیڕۆ دەچن، دواجار لە دەرەوە فڕێدەدرێن و ژینگەش پیس دەکەن و گازی میسان دروست دەکەن. گازی میسانیش ٢٣ جار لە گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن مەترسیدارە.(٨)

چیتر درەنگە بۆ گەشبینی، کاتی ئەوە هاتووە بەڕاستی دەستبکەین بە ئیش بۆ ئەم تاقانە زەوییەی کە لە سەری دەژین.

ئێمە لەم سەر زەوییە هەموو بەرپرسین لە یەکتر. ئێمە هەموو پێکەوە ئەندامیکی ئەم خێزانە گەورەیەین کە پێیدەگوترێت مرۆڤایەتی. ئێمە کە تا ئێستا لەسەر زەوی دەژین، وەک پێویست نە هاوکاری یەکدیمان کردووە و نە تەواو بەوەفابووین بەرامبەر زەوی.

بیریشمان نەچێت کە زۆربەی کێشەکان لە ناو شارەکانەوە سەرهەڵدەدەن، بۆ نمونە ٥٤٪ ی خەڵکی دونیا لە شارەکاندا دەژین، ٧٥٪ ی وزەی دونیا، لە شارەکاندا بەکاردەهێنرێن، ٨٠٪ ی پیسبونی هەوا، شارەکان پیسی دەکەن.(٩)

بەڵێ کۆمەڵێک داتای دڵخۆشکەریش هەن، هەر بۆ نمونە، لە ساڵی ٢٠٠٢ تا ٢٠١١ ڕێژەی مردن بە نەخۆشی مەلاریا بەڕێژەی ٧٥٪ کەم کراوەتەوە لە هەشت وڵات کە ئەوانیش (جەزائیر، بۆتسوانا، کاپی ڤێردۆ، نامیبیا، ڕواندا، سوازیلاند، ئەفریقای باشور، ساوتۆم و پرێنسیپ)ن.

لە ساڵی ١٩٩٠ تا ٢٠٠٠ ڕێژەی مردنی منداڵی خوار ٥ ساڵ، ساڵی ٢،٦٥ ملیۆن منداڵ ڕێژەی مردنیان کەم کراوەتەوە. واتە ٧٢٥٦ منداڵ لە ڕۆژێکدا کەمتر دەمرن لە چاو پێشوودا.

لە ساڵی ١٩٩٠ بۆ ساڵی ٢٠٠٠، ڕێژەی مردن لەبرسا، ٤٣٪ کەمبوەتەوە بۆ ٣٣٪. لە ٢٠١٠ بووە بە ٢١٪.(١٠)

ڕاستە هەموو ئەو داتایانە هەواڵی دڵخۆشکەرن، بەڵام خودی ئەو هەواڵە دڵخۆشکەرانەش لە ناو خۆیاندا، هەڵگری هەواڵێکی ناخۆش و مەترسیداریشن. چونکە پێمان دەڵێن، کە هێشتا ڕێژەیەکی زۆری قوربانی دەستی هەژاری و نەخۆشی هەیە. کەسانێک هەن ژیانیان لەمەترسیدایە و گیان لەدەست دەدەن. هەبوونی

هەواڵ و داتای دڵخۆشکەر نابێت بمانوەستێنن و لە کارکردن خاومان بکەنەوە. تا ئەوکاتەش کەسێک هەبێت سەرما و برسیبێت، کەواتە ئێمە بە تەواوەتی کارمان نەکردووە و تەواو خۆمان ماندوو نەکردووە. زۆر گرنگە زیاتر لەوە بکەین کە لە تواناماندایە.

خاک و ئاو و هەوا و مرۆڤ و ئاژەڵەکان، ڕووەک درەخت، هەموو پێکەوە بەستراوین و تەواوکەری یەکترین. بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ سەرمایەداری خەریکە ئەو پەیوەندیە زیاتر دەبچڕێنێت کە لە نێوانماندا هەەیە. هەموو ئەو کارەساتانەی بەسەر زەویدا دێت، شتانێکی بینراو و هەستپێکراون و هەمووومان ئاگادارین چی ڕودەدات. بەڵام هێشتا بەردەوامین لە ئەنجامدانی و بێباکین و نامانەوێت بوەستین. ئێمە وەک مرۆڤ، ئەو ئەرکەی لەسەر شانمانە وەک خۆی بە ئەنجاممان نەگەیاندووە. هەموو ئەوەی کە ڕودەدات لەسەر زەوی، کاردانەوەی کارەکانی خۆمانە. زەوی تەنها وێنەدانەوەی خۆمانمان پیشاندەدا...


پەراوێز:

1- https://www.ted.com/talks/fred_swaniker_the_leaders_who_ruined_africa_and_the_generation_who_can_fix_it

2- Home Documentary, Directed by Yann Arthus-Bertrand, 2009.

3- https://www.ted.com/talks/samantha_nutt_the_real_harm_of_the_global_arms_trade

4- TED Talks- Why Food Drives Contribute To Hunger in America/ Gray Oppenheimer

5- https://www.ted.com/talks/jacqueline_novogratz_invests_in_ending_poverty

6- https://www.ted.com/talks/andrew_youn_3_reasons_why_we_can_win_the_fight_against_poverty

7- TED Talk- Why I live a zero waste life - Lauren Singer - TEDxTeen – YouTube

8- Home Documentary.

9- https://www.ted.com/talks/alessandra_orofino_it_s_our_city_let_s_fix_it

10- https://www.ted.com/talks/bono_the_good_news_on_poverty_yes_there_s_good_news

(ناوت چییە؟ تەمەنت چەندە؟)

ناوم خۆهیتۆن-ە. دڵم تەمەنی نییە. هەندێ جار هەست دەکەم کچێکی گەنجم. گۆرانی دەڵێم و جۆلانێ دەکەم. بەراستی پێمبڵێ، بۆچی تەمەنی منت پرسی؟ ڕەنگە تۆش وەک ئەوان پێت وابێت، پیربوون واتە مردن! نا وانییە کوڕی خۆم. هەموو تەمەنێک جوانی خۆی هەیە.





شۆهیل، «باشترین شتی ئەو کە پێی سەرسامم، ئەوەیە دەتوانێت بە درێژایی شەو گوێ لە گۆرانیەکانم بگرێت. لە کاتێکدا هاوڕێکانم ناتوانن تەنانەت چەند خولەکێکیش گوێم لێبگرن.»

نارگیس بە پێکەنینەوە، «ناخۆشترین دەنگی هەیە، بەڵام لە دڵەوە گۆرانی بۆ من دەڵێت. لەبەر ئەوە ئامادەم تا کۆتایی ژیانم گوێی لێبگرم.»

نارگیس بیست ساڵ و شۆهێل بیست و شەشە. هەردوو لە کۆمپانیایەک بەرگدروون و بۆ ماوەی سێ ساڵە هاوسەرگیرییان کردووە و ژیانێکی بەختەوەرانە دەژین.

بۆ بەدەستهێنانی ئاوی خواردنەوە، هەندێک جار پێویستە بەیانیان لە دوای نوێژی بەیانییەوە لە ڕیزدا بوەستین. کاتژمێر نۆ تەنکیەکە بەتاڵ دەبێت. ئیدی هەندێکمان بە ناچاری بە سەتڵی بەتاڵەوە دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە.
هەندێک کاتیش کە لایەنی پەیوەندیدار دێت و کارەبا نایاساییەکەی کوچەکەمان دەبڕێت، دەبێت لەگەڵ تاریکی بجەنگیین. کاتێک ئاو تەواو دەبێت، دەبێت لەگەڵ تینوێتی بجەنگین، دەبێت لە پێناو خواردن بجەنگین، لە پێناو جلوبەرگدا. تەنانەت لەگەڵ چوون بۆ تەوالیتیش. تەنها شت کە پێویست ناکات بۆ بەدەستهێنانی بجەنگین، خەمە.

خۆشترین ڕۆژەکانم ئەو ڕۆژانەن کە سەتڵەکەم پڕ لە ئاو دەکەم، کە دەتوانم لە کەمتر لە کاتژمێرێکدا بچم بۆ تەوالێت، کە دەتوانم شتێک پەیدا بکەم تا منداڵەکانم شەو بیخۆن.
هەموو ژیانمان بریتییە لە جەنگ لەگەڵ شتی بچووک و بۆ هێنانەدی خەونی بچووک.

- ڕازییە





دەتەوێت چەند پرسیارێکم لێ بکەیت؟ با من سەرەتا چەند پرسیارێک لە تۆ بکەم؟

– دەزانیت ئەوە چ هەستێکە کاتێک منداڵەکەت دەبینی لە برسا دەگری؟ ڕۆژ هەبووە لە ژیانتدا نەتوانی کرێی خانووەکەت بدەیت و خاوەن خانووەکە لە بەرامبەردا داوای جەستەتی کردبێت؟ هەرگیز دایک و باوکت داوایان لێکردوویت منداڵەکەت بفرۆشیت؟ تۆ مێردەکەت جێیهێشتویت کاتێک زانیبێتی منداڵێک لە ڕەحمتایە؟ ئاهـ ببورە بیرم چوو کە تۆ پیاویت.
– بەڵام برسیەتیت ئەزموون کردووە؟ هەرگیز خیانەتت ئەزمون کردووە؟ گریانی بەردەوامی ڕۆژانەت ئەزموون کردووە؟
ئەگەر هیچ لەمانەت بەسەر نەهاتووە، کەواتە هەرگیز تێناگەیت من بە چ ژیانێکدا تێپەڕیوم. برۆ چێژ لە ژیانی خۆت ببینە…

– بیلکیس

ئەم دوو ڕۆژە ناچم بۆ کار، پێویستە لەگەڵ ژنەکەم بمێنمەوە. ئێمە مۆبایلمان نییە، ئەگەر پێویستی بە شتێک بێت چۆن ئاگادارم بکاتەوە؟ ئێمە لە دورگەیەک دەژین. خەڵکی بۆ هاتن بۆ نەخۆشخانە توشی ئاستەنگیەکی زۆر دەبن.
کە ژنەکەم نەخۆش کەوت و دەمبینی زۆر دەڕشێتەوە. داوام لە خاوەنی بەلەمەکە کرد بمانبات بۆ نەخۆشخانە، بەڵام ئەو پێی گوتم کە شەوان کار ناکات. هەموو پێیان دەگوتم کە نەیەم بۆ نەخۆشخانە، بە دایکم و باوکیشمەوە، بەڵام نەمتوانی لەوە زیاتر دانیشم و هیچ نەکەم، لە کاتێکدا ئەو ئازارێکی زۆری دەچەشت. بۆیە هەستام و بە تەنها بەلەمەکەم لێخوڕی. دوای ڕووبەڕووبونەوەی چەندین ئاستەنگ، لە کۆتاییدا بێ زیان گەیشتینە نەخۆشخانە. ئێرە پڕە لە نەخۆش، پەرستارەکان پێیان گوتم کە دەبێت چاوەڕێ بکەم تا قەرەوێڵەیەک بەتاڵ دەبێت.
ژنەکەم زۆر دەترسێت، بۆیە یەک لە دوای یەک نوکتەی بۆ دەکەم. دەمەوێت ئەو پێبکەنێت. ئەو کاتانەی ئەو پێدەکەنێت، هەست دەکەم هەموو شتێ باشە...

– تەیب





ئێمە هەژارین. دایکم پارەی نیە سەوزە بکڕێت. ئەو تەنها دەتوانێت برنج و خوێ بکڕێ. بۆیە پێویستە من بێمە بازاڕ و بگەڕێم سەوزەی فڕێدراو کۆبکەمەوە و بیبەمەوە. خوشکە بچووکەکەم لەماڵەوە چاوەڕوانم دەکات. زۆر حەزدەکات خواردنی خۆش بخوات.

– شوخی، ٦ ساڵ

ئەگەر تۆ بۆ دەستکەوتنی ژەمە نانێک پێویستت بە گەڕانی ناو تەنەکەخۆڵەکان نییە، کەواتە هاوڕێ گیان تۆ لە زۆر کەس بەختەوەرتریت. تکایە کەمێک لە خواردنەکەت بەشی ئەو کەسە بدە کە زبڵدانەکان دەگەڕێ. دڵنیابە زۆر نزیکە لێتەوە. تەنها چاو بکەیتەوە دەیبینیت ...

– ئاکاش

زۆر حەزم دەکرد بچم بۆ قوتابخانە، بەڵام لە دوای کۆچی دوایی باوکمەوە، دایکم پێویستە بچێت کار بکات. منیش ئەرکی چاودێریکردنی برا بچووکەکانم لەسەرە لە ماڵەوە. هەمیشە تەماشای هاوڕێکانم دەکەم کە دەچن بۆ قوتابخانە، بەڵام بە هۆی تۆفانەوە چەند ڕۆژێکە نەیانتوانیوە بچن بۆ قوتابخانە. زۆر غەمبار بووم کە دەمبینی خوێندنیان لەدەست دەچێت. بۆیە بەم بەلەمە هاوکارییان دەکەم و لەم ئاوە دەیانپەڕێنمەوە. نامەوێت لە چێژی چوون بۆ قوتابخانە بێبەش بن...

– بریستی



هەرگیز ڕوخساری دایک و باوکم بیر ناچێتەوە، لەو شەوە درەنگەدا کە باسی منیان دەکرد. لە پشتی پەردەکەوە وەستابووم. ئەوان دەگریان. من نەگریام، نەمویست بزانن کە من لەوێم و گوێم لە قسەکانیان بووە. ئەو شەوە زۆر ترسام، ویستم لە باوەشی دایکمدا بخەوم، بەڵام نەچووم، چونکە دەبوایە بەرەنگاری گەورەترین حەقیقەتی ژیانم ببمەوە. خوێندکارێکی زۆر ژیر بووم. کۆمەڵێک پلانی زۆرم هەبوو بۆ داهاتوو. بەڵام لەو چرکەیەدا وازم لە هەموو پلانەکانم هێنا و چەند پلانێکی نوێم دانا تا جێبەجێیان بکەم پێش ئەوەی بمرم. ڕۆژێک هۆنراوەیەکم بۆ خۆم نووسی. دواتر جێیدەهێڵم بۆ ئەوان وەک یادگاری. هەر ڕۆژە و لەگەڵ هاوڕێیەکمدا بەسەر دەبەم. سەردانی هەموو ئەو شوێنانەم کرد کە دەمویست سەردانیان بکەم. ڕۆژێک لە ڕێگەی فەیسبووکەوە کەوتمە قسەکردن لەگەڵ کوڕێکدا. هەستم دەکرد ئەو ئازارە نەوتراوەکانم دەبیستێ. هەستم کرد بینینی ئەو سەرکەشییە، بۆیە هەرگیز یەکمان نەبینی. . جارێکیتر هەرگیز نامەی بۆ نانێرمەوە. بۆی نوسیم « تا ئەبەد چاوەڕێت دەکەم.» من پێم وانیە هەرگیز لەم شێرپەنچەی مێشکە ڕزگارم ببێت. ئەمە دواهەمین گەشتی ژیانمە.ماڵەوە هێنایانم بۆ بینینی دەریا. زۆر دڵنیام کە ئەم فۆتۆیەی تۆ، دواهەمین فۆتۆی ژیانم دەبێ ...

– بوشرا، ٢٠ ساڵ



زۆر منداڵ بووم کە دایکم کۆچی دوایی کرد. هەمیشە هەوڵم دەدا زڕدایکەکەم دڵخۆش بکەم، بەڵام نازانم بۆ ئەو تەنانەت بەرگەی بینینی سێبەرەکەشمی نەدەگرت. زۆر لێی دەدام. دەبوایە ئەو ساتانەی لێمی دەدا بە بێدەنگی بوەستم و نەگریم. چونکە پێی گوتبووم ئەگەر بگریم، لەو ماڵە فڕێم دەداتە دەرەوە. دوای بەرگەگرتنی هەموو ئەوانە، دواجار ڕۆژێک لە ماڵەکەی خۆم دەری کردم. بە درێژایی ئەو شەوە لەبەردەم دەرگەی ماڵەوەدا گریام، بەڵام تەنانەت باوکیشم نەهات بمباتەوە ماڵەوە. لە (جاتپوور)ـەوە هاتم بۆ (دەکە). بێئیش بە شەقامەکاندا دەسوڕامەوە و هەندێک جار خواردنی فڕێدراوی ناو تەنەکەخۆڵەکانم دەخوارد. تا ڕۆژێک ئەم کارەم دەست کەوت. کاری (پاککردنەوە). بەڵام شتە ناخۆشەکە ئەوەیە کە هەموو کەس ڕقی لێمانە. کەس قسەمان لەگەڵ ناکات. براکەم، ئەمڕۆ دڵم زۆر خۆشە، چونکە پێشتر کەس فۆتۆی نەگرتووم. تا ئێستا کەس لێی نەپرسیوم ئایا شتێکم هەیە بمەوێت بیڵێم. کاتێک چیرۆکی منت بۆ خەڵکی گێڕایەوە، پێیان بڵێ «تکایە ڕقتان لە ئێمە نەبێت. ئەگەر ئێمە واز لە پاککردنەوە بێنین، پیسی ئێوە دەکوژێت. ئێمە خزمەتکاری ئێوەین. ئێمە دەچینە ناو پیسییەکانی ئێوەوە و پاکیان دەکەینەوە. تکایە بە چاوی ڕقەوە سەیرمان مەکەن».



– مد ڕابی, ١٨ ساڵ

بەر لە هاوسەرگیریی، سێ جار ژوانمان دانا. پێکەوە چووین بۆ سینەما و سەیری فیلممان کرد. دەمبینی چەندە پاڵەوانی فیلمەکانی خۆشدەوێت و چەندە سەرسامی شەڕەکانیانە! بۆیە منیش بڕیارم دا وەک پاڵەوانەکان پۆشاک بپۆشم. تەنانەت هەوڵمدا چەند شەڕێکیش بکەم تەنها بۆ ئەوەی ئەو دڵخۆش بکەم. بەردەوام بە بەردەمماڵیاندا دەڕۆیشتم تا ئەو جلوبەرگ و ستایلەم ببینێ.
ڕۆژێک باوکی هاتە بەردەمم و گوێچکەی گرتم و بردمییە ژوورەوە. بێ ئەوەی لە هیچ تێبگەم، باوکی هاواری کرد « ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ ئەم پاڵەوانە گەمژەیەدا بکەیت، پێکەوە لەبری نان دەبێت هەوا بخۆن.» لە پاڵەوانەوە بووم بە جرج بەدەستیەوە. بە هەر شێوەیەک بووە هەوڵم دا هەڵبێم. «نازی» هاتە بەردەمم و لێیپرسیم «دەتوانیت کارێک بدۆزیتەوە و نان پەیدا بکەیت؟» منیش گوتم «هەرچیم لەدەست بێت دەیکەم.»
ڕۆژی دواتر بە ڕەزامەندی بنەماڵەکەی، هاوسەرگیریمان کرد. لەو ڕۆژەوە تا ئێستا، چەندین جۆری کارم تاقیکردووەتەوە و باوکی دوو منداڵیشم.
ڕۆژێک لە «نازی»یەم پرسی «بەوە بێتاقەت نیت کە من وەک پاڵەوانەکان نیم و ناتوانم وەک ئەوان شەڕ بکەم؟» بە پێکەنینێکەوە وەڵامی دامەوە «پاڵەوانی ڕاستەقینە کەسێکە کە شەڕەکات لە پێناو بەخشینی خۆشەویستی بە خۆشەویستەکەی. کەواتە تۆ پاڵەوانیت.»

– یوسف





کوڕەکەم وادەزانێت من دزم. ئەو پێنج ساڵ بوو کە باوکی لە پێناوی ژنێکی دیکەدا منی جێهێشت. هەموو جۆرە کارێکم کرد بۆ ئەوەی نانی بۆ پەیدا بکەم. بە هەموو ژیانم درۆم نەکردووە. ئەو کاتانەی کارم دەست نەدەکەوت سواڵم دەکرد بۆ کەمێک ئاردی برنج تەنها بۆ ئەوەی ئەو برسی نەبێت. ئێستا گەورە بووە. ڕەنجی ٢٠ ساڵی کارکردنی خۆمم دا پێی تا دوکانێکی بەقاڵی پێ بکاتەوە. نازانم بۆ بوکەکەم خۆشی نەدەویستم! چێشتم بۆ لێدەنان، کوڕەزاکانمم بۆ بەخێودەکردن، هەموو شتێکم کرد تەنها بۆ ئەوەی لەوە تێبگات کە من خۆشمدەوێت. بەڵام هەموویان بێ سوود بوون. ڕەنگە هەڵەکە لە منەوە بێت. ڕەنگە من نەمتوانیبێت خۆشەویستی خۆمیان پیشان بدەم. مانگی پێشوو، ڕۆژێک بوکەکەم لە ناکاو پێیگوتم کە تاکێک لە گوارە ئاڵتونەکەی دیار نەماوە. هەموو سوچ و قوژبنێکی ئەوماڵە گەڕام، بەڵام نەمدۆزییەوە. شەو کاتێک کوڕەکەم لە کار گەڕایەوە، هاتە ژورەکەم و داوای لێکردم کە تاکە گوارەکەی بدەمەوە. دەنگی بە جۆرێک سارد بوو من هیچم پێ نەگوترا. فرمێسکەکانم هەموو ئەو شتانەیان گوت، کە من دەمویست بیانڵێم. هەر ئەو شەوە ئەو ماڵەم بەجێهێشت. هیچ کەسیان نەهاتن ڕێم لێبگرن و داوام لێبکەن نەڕۆم. کوڕەزاکانم لە ناو دەرگەکەدا وەستابوون. دەستم بۆ بەرزکردنەوە و ئەوانیش دەستیان بۆ بەرز کردمەوە. ئێستا من لەسەر شەقامەکان دەژیم. نامەوێت چیتر لە هیچ ماڵێکدا بژیم...

- ماجدە، ٤٨ ساڵ

ئێمە هەموو ئەو ئیشانەمان دەکرد کە پیاوەکان دەیانکرد، تەنانەت ژمارەی کاتژمێری کارکردنیشمان وەک ئەوان بوو، بەڵام کاتێک چووم بۆ لای بەڕێوەبەرەکەم تا کرێکەم وەربگرم، ٥٠ تەکە کەمتر لە کرێکارە پیاوەکانی داپێم. پێمگوت چ هەڵەیەکم کردووە کەمترم ئەدەیتێ؟ بەسەرما هاواری کرد و گوتی «تۆ ئیشت لەوان زیاتر کرد، بەڵام تۆ ژنیت و کراست (قمیص) لەبەردا نییە، کەواتە هەمیشە کەمتر وەردەگریت.» ڕۆژی دواتر بە کراسەوە چووم بۆ سەر کار. هەموو پیاوەکان پێم پێدەکەنین، بەڵام هەموویانم پشتگوێ خست. لە کۆتاییدا داوام لە بەڕێوەبەرەکەم کرد هێندەی پیاوەکان کرێم بداتێ چونکە بەقسەم کردووە و وەک پیاوەکان کراسم لەبەرکردووە. زۆر بە ڕونی دەمبینی کە سڵی لە قسەکانم دەکردەوە و ئازایەتیەکەم ترساندویەتی، بەڵام جارێکیتر گوتی «لە کاتێکدا وەک پیاوەکان پارە وەردەگرن، ئەگەر هەموو ژنەکان کراس لەبەر بکەن.» پاشان سەیرێکی کردم، چاوەکانی لە چاوی ڕێوی دەچوون. بێ هیوا بووم، دڵنیابووم هیچ ژنێک کراس لەبەر ناکات. ڕۆژی دواتر کە چووم بۆ سەر کار، بینیم هەموو ژنەکان کراسیان لەبەردایە. هەموو کراسێکی مێردەکەیان کردبوو بەسەر جلەکانی خۆیاندا. بەڕێوەبەرەکەمان کاتێک هەموومانی پێکەوە بینی، زۆر ترسا. بۆ یەکەم جار لە مێژووی دە ساڵەی ئەو کارگەی خشتەدا، ژن و پیاوەکان هێندەی یەک کرێیان وەرگرت. لەو ڕۆژەوە هەموو خاتوونەکان پێمدەڵێن پاڵەوان...

– تەسلیمە



ڕۆژێک لە ڕۆژان منیشماڵ و خێزانی خۆمم هەبوو. مێردەکەم چێشتی دەستی من نەبوایە نەیدەخوارد. هەندێک جار هەندێک شتی بۆ دەهێنامەوە تا سەرسامم بکات، وەک ئاوێنەی دوو دیوی لێوار زیوین. دوو ساڵی یەکەمی هاوسەرگیریمان زۆر باش ڕۆیشت، ژیانمان لە داستانەکانی ئەشق دەچوو، خۆشترین چرکەساتەکانی ژیانم ژیام. کاتێک دووگیان بووم، گەڕامەوە بۆ گوند. چەند مانگێک تێپەڕی و ئەو هەر دیار نەبوو. شەش مانگ بوو تەنانەت یەک جاریش نەهاتبوو بۆ سەردانم. زۆر دەترسام شتێکی بەسەر هاتبێت، بۆیە بێ ئەوەی بەکەس بڵێم، لە گوندەوە هاتمەوە بۆ شار بۆ سۆراغی ئەو. کاتێک چوومە ماڵەوە، بینیم لەسەر جێگەی نوستنەکەمان لەگەڵ ژنێکی دیکە دانیشتووە و نان دەخوات. زۆر بە سانایی بە ژنی دووهەمی ناساندم، بێ ئەوەی هیچ هەست بە تاوان بکات هەستم دەکرد زەوی لەژێر پێمدا دەجوڵێت، بێ هیچ قسەکردنێک بەجێم هێشت و هاتمە دەرەوە. کاتێک کوڕەکەمم بوو، تەمەنم بیست ساڵ دەبوو. ساتی لەدایک بوونەکەی، هیچ کەسێکم لەگەڵ نەبوو بیگرێتە باوەش. بە هۆی گەڕان لە زبڵدان، توانیم بەخێوی بکەم و بینێرمە بەر خوێندن. دە ساڵ بەر لە ئێستا (ڕاشێڵ) ی کوڕم هاوسەرگیری کرد.ژنەکەی قایل نابێت لەگەڵ من بژی، بۆیە کوڕەکەم و ژنەکەی ڕۆشتن و منیان بە تەنها بەجێهێشت.

لە ئێستادا هەست دەکەم کێشەیەکم هەیە. هەست دەکەم من ناتوانم خۆشبویستریێم یاخود کەسم خۆش بوێت. هەست دەکەم شایەنی خۆشەویستی نیم. هەرگیز پێموانەبوو ژیان بەم شوێنەم دەگەیەنێت.



ئەوە بۆ سی ساڵ دەچێت لەم خۆڵە عەمەلەیەدا ئیش دەکەم. شەوانیش دەچم بۆ سەر شەقامەکان و لەگەڵ نەناسەکان و هەندێ جاریش لەگەڵ ئاژەڵ دەخەوم.

– بیلو بێگوم، ٥٢ ساڵ

زۆر دەترسم لەوەی شەوان بە تەنها بخەوم، ئەوانیش وەک من لە تەنهایی دەترسن، تەنانەت سەگەکەشمان. بە ڕۆژ شەڕ لەگەڵ یەکتر دەکەین لەپێناوی کار و پەیداکردنی ناندا، بەڵام بە شەو نزیک یەک دەخەوین.

ئێمە لەم دونیایەدا کەسمان نییە، تەنها هاوڕێیەتی یەکتر شک دەبەین...

– شەریف



نێوانم لەگەڵ زڕدایکەکەم زۆر خۆش بوو، ئەو وەک گوڵ وابوو. لەو کاتەوەی لەگەڵ باوکم هاوسەرگیری کرد، من هەموو کاتەکانم لەگەڵ ئەو بەسەر دەبرد. هەوو نوکتە خۆشەکانی دونیای بۆ دەکردم و دەیخستمە پێکەنین. هەموو جۆرەکانی خەیارشۆری بۆ دروست دەکردم. هەموو دەیانگوت کە زڕدایکم جادوگەرە، منیش بە گریانەوە بەرەوڕویان دەوەستامەوە. تەنانەت زڕبراکەشم زۆر خۆشدەویست. هەمیشە پێکەوە یاریمان دەکرد. ڕۆژێک دایکم منداڵی بوو، ئێمەش بووین بە خاوەنی برایەکی بچکۆلە. من و هەموو خێزانەکەشم بەوە زۆر دڵخۆش بووین.

ڕۆژێک دایکم پێی گوتم «دەمەوێت بە بەلەمەکە بچم بۆ ناو ڕوبارەکە، دەمەوێت تۆش لەگەڵم بێیت.»، بەڵام داوای لێکردم ئەمە بە باوکم نەڵێم، چونکە من لە ئاو دەترسام، باوکم هەرگیز ڕێگەی نەدەدام بچمە ناو ڕوبارەکە. بێ ئەوەی هیچ شتێ بە هیچ کەسێک بڵێم، لەگەڵ دایکم و ئامۆزایەکیدا چووین بۆ گەشتێکی ناو ڕوبارەکە. دوای نیوەڕۆیەکی زۆر جوان و خۆش بوو. دایکم داوای لێکردم گوڵێکی خۆڕسکی سەر ئاوەکەی بدەمێ. کاتێک خۆم چەماندەوە گوڵێک لێبکەمەوە، پاڵم پێوە نرا بۆ ناو ڕوبارەکە. بێ ئەوەی لە هیچ تێبگەم، خۆم لە ناوەڕاستی ڕوبارەکەدا بینییەوە و وردە وردە نوقم دەبووم. بەلەمەکەیانم دەبینی کە لێم دوور دەکەوتەوە. نازانم چەندە کات تێپەڕی تا بەلەمێکی ماسیگرتن هات و ڕزگاری کردم. لەگەڵ ئەو ماسیگرەدا نانی نیوەڕۆم خوارد. چیتر هەوڵی ئەوەم نەدا خێزانەکەم بدۆزمەوە. ئەو پاڵنانە منداڵیمی لەگەڵ خۆی برد و بووم بە منداڵێکی گەورە. زۆر جۆری کارم تاقیکردەوە تا بەردەوامبم لە ژیان. ئێستا هاوکاریی شۆفێری ڤانێک دەکەم کە سەتڵی ئاو دەگوازێتەوە. زۆر ساڵ بەسەر ئەو پاڵنانەدا تێپەڕی، بەڵام من هێشتا ئەو خەونە ناخۆشە دەبینم کە لە ناو ڕوبارێکدام و نوقم دەبم و هەمووان پێم پێدەکەنن.

– مانیک



هەموو پێیان وایە کە مرۆڤ پیر بوو، ئیدی هیچی بیرنامێنێ، بەڵام ئەوە ڕاست نییە. من دەموچاوی هەموو ئەوانە دەناسمەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان خواردنیان داوە پێم. زۆر بە ڕونی منداڵیمم بیردێت. تەنها دوازدە ساڵ بووم کە غەزورم هاوسەرگیری من و کوڕەکەی خۆی ڕێکخست. ئەرکی من چاودێریکردنی هەر سێ منداڵەکەی مێردەکەم بوو کە بەو دواییە دایکیان کۆچی دوایی کردبوو، بەڵام ئەوان بۆ من وەک بوکەشوشەی ڕاستی وەهابوون. هەرگیز هەستم بە ناتەواوی نەدەکرد بەوەی کە منداڵی خۆمم نەبوو. دوای چەند ساڵێک، مێردەکەم کۆچی دوایکرد. وردە وردە کوڕەکانم گەورە بوون و خێزانی خۆیان پێکەوە نا و منیش بووم بە کەسێکی نەناس لە ناویان دا. دەستیانگرت بەسەر هەموو خانوو و سامانەکانی باوکیان داو و پێیان گوتم کە من پەیوەندییەکی خوێنیم نییە بەوانەوە، هەموو ئەو قسانەم بیردێت کە پێیان گوتم. هەموو ئەو شەرمەزارییانەم لەیادە کە بەرەوڕووم بوونەوە. لەم سەر زەوییە شتێک نییە بە ناوی «پەیوەندی نێوان دڵەکان»ـەوە. من ئێستا دواهەمین ڕۆژەکانم دەژمێرم و سواڵی مردن دەکەم...

– عائشە



– دەزانیت ئەوە وێنەی کێیە لەسەر تیشێرتەکەت؟

– بەڵێ، ئەوە سپایدەرمانە.



–سپایدەرمان چی دەکات؟

–ئاو دەفرۆشێت.

(لەگەڵ ڕیدۆی)

من هیچ تایبەتمەندییەکم نییە. هیچ شتێکم لە زەیندا نییە ئێستا باسی بکەم. من ماسی ڕاودەکەم بۆ دایکم و هەروەها چاودێری تەویلەی دراوسێکەشمان دەکەم، بەڵام دایکم پێی وایە من کوڕێکی زۆر ئازام. مانگی پێشوو، شەوێک کەسێک ئاگری بەردایە تەویلەیماڵەکەی دراوسێمان. هەردوو دەرگەی پێشەوە و دواوەی تەویلەکەشیان لە دەرەوە داخست. هەموو ئاژەڵەکان لە ناوەوە گیریان خواردبوو. دایکم ویستی بموەستێنێت بەڵام من هەر چووم بۆ ڕزگارکردنی ئەو ئاژەڵە بێ تاوانانە. دەرگەی پشتەوەم شکاند و چومە ناو تەویلەکە. لە کاتێکدا هەوڵم دەدا ئاژەڵەکان ڕزگار بکەم، ئاگرەکە زۆر زیاتر گەشەی سەند، بەڵام توانیم ڕوحی خۆم و هەموو ئاژەڵەکانی دیکە ڕزگار بکەم. کە هاتمە دەرەوە پێش ئەوەی ببورێمەوە بە چرپە بە دایکمم گوت «دایە گیان نامەوێت بمرم». هاهاها من هەمیشە لە مردن دەترسم...

– نۆیۆن



ماندوم، زۆر ماندوم. ماندوم لە شەڕ کردن لە پێناویناندا، شەڕکردن لە پێناوی ژیاندا، لە پێناوی خۆشەویستیدا. هەرگیز کەس خۆشی نەویستوم. نازانم هەستی خۆشویستن چۆنە. کاتێک لە کار دەگەڕێمەوە، خێزانەکەم داوای پارەم لێدەکەن. کاتێک پارەکەیان دەدەمێ، پێدەکەنن. جارێک تام هەبوو، بۆ ماوەی هەفتەیەک نەمتوانی بچم بۆ کار. باوکم جێ خەوەکەمی لە ماڵەکە دەرکرد و فڕێی
دایە حەوشەکەوە. تا ئەو ساتەی توانای ئیشم هەبێت، توانای ژیانم هەیە. کاتێک سکم پێنج مانگ بوو، مێردەکەم جێیهێشتم. ئەوە پێنج ساڵ دەبێت نەمبینیوەتەوە. هەرگیز خۆشی نەدەویستم. چەند جارێک لەگەڵ ژنی دیکەدا دەمبینی، بەڵام لە پێناو خۆشەویستی ئەودا دەجەنگام و بەرگریم لێدەکرد. هەندێک جار بیر لەوە دەکەمەوە هەمو شتێک جێبهێڵم و لێرە دوور بکەومەوە، بەڵام هیچ شوێنێکم نیە بۆی بچم. من خۆم بەم شەمەندەفەرەدا هەڵدەواسم، وەک چۆن خۆم بە ژیاندا هەڵواسیوە. لەگەڵ ئەوەدا کە دڵنیام ئەم شەمەندەفەرە نامگەیەنێتە هیچ شوێنێک کە کەسێکی لێبێت گرنگیم پێبدات، بەڵام هێشتا هەر خۆمی پێدا هەڵدەواسم و چاوەڕوان دەکەم...



ئێمە کاتژمێر حەوتی بەیانی دێین بۆ کار. بە هۆی کارکردنی بەردەوامەوە، ئاگامان لەوە نیە کەی دونیا تاریک دەبێت. ئێمە لە تاریکیدا لە ژێر تیشکی ئەم گڵۆپە زەردانەدا کار دەکەین. تیشکی خۆر ناگاتە ناو کارگەکەمان. هەندێک جار کە کارەبا دەکوژێتەوە، دەچینە دەرەوە، بەڵام چیتر حەزمان لە یاریکردن نییە. چونکە زۆر ماندووین. ئەوەی ڕاستی بێت لە کاتژمێر سێ-دا زۆر برسیمان دەبێت، بەڵام برنج زۆر گرانە، ئێمە مانگی هەزار تەکەمان هەیە. چۆن بتوانین بیدەین بە برنج؟ لەبەر ئەوە بەم سەمونە خۆڕاییە قایلین کە بۆ نانی نیوەڕۆ پێمان دەدرێ. کاتێک برسیت دەبێت، هەموو خواردنێک لەلات بەلەزەت دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو سەمونە تێرمان ناکات و هێشتا هەر هەست بە برسێتی دەکەین، بەڵام کاتێک ئێوارە دەچینەوە بۆ ماڵەوە، دایە خواردنی خۆشی بۆ لێناوین، برنجی گەرم بە پەتاتەوە. بۆ خەڵکی هەژار هەبونی ژەمێک خواردن لە ڕۆژێکدا باشە. فەرموو قوربان سەمونێکمان لێوەرگرە و لەگەڵمان بخۆ، تامی زۆر خراپ نییە ...



- ئەدۆر و شۆهانگ

دایکم پێمدەڵێت باڵندە، لە کاتێکدا کەس ئەو ناوەی بەدڵ نییە. کە لێی دەپرسم بۆ پێمدەڵێت باڵندە، هەمیشە لە وەڵامدا دەڵێت «هەمیشە ویستومە بفڕم و دونیا ببینم، بەڵام نەمتوانی. ئێستا بە تۆ دەڵێم باڵندە، بەو هیوایەم تۆ بتوانیت ببیت بە باڵی من.» دایکم زۆر سەیرە! پێیوایە مرۆڤ دەتوانێت بفڕێت...

– ئانو



– ئەتوانم کەمێک لەگەڵت بێم و هەندێک فۆتۆت بگرم؟
– بە شوێنکەوتنی من چیت دەست دەکەوێت؟ هیچم نیە لەگەڵت باسی بکەم، نابینیت بەشوێن خواردنێکدا دەگەڕێم بیدەم بە منداڵەکەم؟
– قاچی چەپت بە چی بریندار بووە؟ ئازارت هەیە؟
– خەڵکی شتی تیژ و شوشەی شکاو فڕێ دەدەنە ناو زبڵداکانەوە. هەرگیز بیر لەوە ناکەنەوە کە کەسانێکی وەک من هەن بۆ دەستکەوتنی خواردنی ڕۆژانە، دەبێت ناو زبڵدانکان بگەڕێن. کەسێک لە ئێوە شوشەی فڕێدابووە ناو زبڵدانەوە و منیش لە کاتی گەڕان بە دوای خواردندا قاچم بڕا، بەڵام ئاساییە، من لەگەڵ ئازار ڕاهاتووم.
– دەزانیت سبەی جەژنە؟
– بەڵێ، ئەگەر مانگ ببینرێت جەژنە، بەڵام بۆ ئێمەی هەژار مانگ و خۆر وەک یەکن. سەیری من بکە، من وەک ئەوان جلوبەرگم نییە بیپۆشم، ئەوەتا سبەی جەژنە و ئێمە ئەمڕۆ زبڵدانەکان دەگەڕێیین. مانگ تەنها لە ژیانی دەوڵەمەندەکاندا دەردەکەوێت. ئەوان پێویستیان بەوە نیە بە زمانی بەڕۆژووەوە زبڵدانەکان بۆ خواردن بگەڕێن تا بیدەن بە منداڵەکانیان. ئەوان چاوەڕوانی جەژن دەکەن بۆ ئەوەی خواردنی خۆش بخۆن و جلی جوان لەبەر بکەن. من حەزم بە جەژن نییە، چونکە جەژن پشووە و زبڵبەرەکان درەنگ دەگەنە لای ئێمە. ئەمەش وادەکات نەتوانین خواردن پەیدا بکەین.


(لەگەڵ خایرۆن)

لەم دونیایەدا خوشکەکەمم لە هەموو کەس زیاتر خۆشدەوێ. لەبەر ئەوە نا کە قوربانیی زۆر بۆ داوم، خۆشمدەوێ چونن مرۆڤێکی تایبەتە. هیچ کەسم نەدیوە ئەوەندە سەرسامکەرانە بەهێز بێت. وەختی نارەحەتیەکانی، فرمێسک و برینەکانیم دیوە بەڵام هەرگیز نەمبینیوە پاشگەز ببێتەوە. هەمیشە ڕێگەیەک دەدۆزێتەوە تا بەسەر نارەحەتیەکانیدا زاڵبێت و بەشکۆوە هەڵدەستێتەوە. وەختێ لە تاقیکردنەوەکانی (ئێس ئێس سی) دا بووم، پارەی تاقیکردنەوەکانم بۆ نەدرا، ئەو کات خوشکم ئەڵقەی هاوسەرگیری خۆی فرۆشت بۆ کرێکەی من. لەژیانمدا بەهێزم چونن دەزانم خوشکێکم هەیە هەرچی ڕوبدات لەلام دەمێنێتەوە. لەژیانماندا زۆر شتمان لەدەست داوە بەڵام هەرگیز پشتگیری یەکتریمان لەدەست نەداوە. هەژاریی بەشێک بوە لەژیانمان بەڵام هەموو جەنگەکانمان پێکەوە ئەنجامداوە. پارساڵ نەشتەرگەرییەکم بۆ کرا، بەدرێژایی هەموو ئەو ڕۆژە، خوشکم لەسەر ئەژنۆکانی نزای بۆ من کردووە. قەترەیەکیش ئاوی نەخواردەوە هەتاوەکوو دکتۆر ڕێگەی دا منیش ئاو بخۆمەوە. هەموو ڕۆژێک، دەڵێم کە خوا ڕوحمی پێ کردووم و ئەم خوشکەی پێداوم. نازانم چیم دەکرد گەر ئەو لەژیانمدا نەبوایە. هەموو نارەحەتییەکان ژیان ئاسانتر دەبن وەختێک خوشکم باوەشم پێدا دەکات و پێم دەڵێت کە هەموو شتکان باش دەبن.

ڕووما



ئەوەندە سەیرم مەکە، بەشت نادەم...

– بابو



ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر و زیاتر ڕقم لە دایکم دەبوو. ڕۆژ نەبوو نەفرەتی بۆ نەنێرم. ئەو بۆ من وەک کەسە خراپەکانی ناو فیلمەکان وابوو کە ساردترین دڵی هەیە لە دونیادا. چۆن ڕقم لێی نەبوویێت! ئەو منی بەجێهێشت لە کاتێکدا من تەنها چل ڕۆژم تەمەن بوو. لە کاتێکدا کە من هێندەی هەموو دونیا پێویستم بە دایک بووە، ئەو جێی هێشتبووم. باوکم و نەنکیشم خۆشیان نەدەویستم، بەڵام هیچ نەبێ جێیان نەهێشتم. هیچ وێنەیەکی دایکمان نەبوو، لەبەر ئەوە نازانم شێوەی چۆن بووە، تەنها ئەوەندەم بیستبوو کە دەڵێن قژێکی ڕەشی پڕی هەبووە.
ژنێک هەبوو وەک تارمایی هەموو ڕۆژێک دوام دەکەوت بۆ قوتابخانە. لە هەموو شوێنێک بەدوامەوە بوو. هەندێک جار، بسکیت و خواردنی دەدا پێم . وای لێهات بوو بە تەنها هاوڕێم. کات هات و کات ڕۆیشت، من بووم بە شازدە ساڵ. ڕۆژێک مامم لەگەڵ ئەو ژنەدا منی بینی. خێرا منی لەو دوورخستەوە، ئەویش وەک ژنێکی شێت دەستی کرد بە گریان. توشی شۆک بووم، نەمدەزانی چی بکەم. دوای گەڕانەوەم بۆ ماڵەوە، پێیان گوتم کە ئەو ژنە دایکمە. ڕقم لە خۆم دەبووە کە ڕێگەم پێداوە نزیک بێتەوە لێم. بۆیە مامم نارد تا پێی بڵێت جارێکیتر لێی نزیک نابمەوە تەنانەت ئەگەر بشمرێت. دواجار ئەو هاوسەرگیری کردبووەوە و خاوەنی ماڵ و کوڕی خۆی بوو، من هیچم نەدەگەیاند بۆ ئەو. دوای چل ساڵ، کاتێک دایکم کۆچی دوایی کرد، خوشکێکی دایکم هات و نامەیەکی دامێ لەگەڵ ئەو سەروەتەی کە دایکم بۆی جێهێشتبووم دوای کۆچەکەی. بۆی نوسیبووم کە ژیانی لەگەڵ باوکم



و بنەماڵەی باوکم چەند ناخۆش بووە. باسی ئەوەی بۆکردبووم کە کاتێک من لەدایک بووبووم و زانیبویان کچم، چۆن ویستبوویان دایکم بکوژن و چۆن پێیان گوتووە، ئەگەر دەیەوێت من بژیم ئەوا دەبێت بەزووترین کات ئەو ماڵە بەجێبهێڵێت. یەک یەک هەموو ڕاستییەکانم بۆ دەرکەوتن بەڵام تازە زۆر درەنگ بوو. هەموو ئەو رقەی باوکم لە مندا دروستی کردبوو بەرامبەر دایکم، کوێریان کردبووم و نەمدەتوانی ڕاستیەکان ببینم. ئێستا دەمرم و تا مردنیش تینوی باوەشێکی دایکمم کە هەرگیز نەمکرد، تینوی ئەوەم کە تەنها جارێکیش بە دایە بانگم نەکرد...

– سێلینا

دڵنیابووم ژنەکەم کێشەیەکی هەیە، بەڵام نەمدەزانی چییە. کاتێک هاوسەرگیریمان کرد، پێموابوو جاریَ گەنجە و دەیەوێت هەندێ مامەڵەی نائاسایی بکات، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات واملێهات لێی دەترسام. دەیتوانی پێشبینی ڕوداوەکان بکات پێش ڕودانیان. جارێک نیوەشەو هەستا و دەستیکرد بە چێشتلێنان. من پێمگوت ئەوە شێتبویتە بەم نیوەشەوە خواردن دروست دەکەیت؟ لە وەڵامدا گوتی «سبەی میوانمان دێت.» لە دوای نوێژی بەیانی بینیم پورم و چوار منداڵەکەی لە دەرگەیاندا کە پێشتر هەرگیز سەردانیان نەکردبووین. ڕۆژ بە ڕۆژ خەڵکی زیاتر و زیاتر باسی ژنەکەمیان دەکرد، بەڵام ئەو گوێی بە قسەی خەڵک نەدەدا. هەندێک شەو هەڵدەستا و پیاسەی دەکرد و پێدەکەنی، ئەو شەوانە نەمدەتوانی بخەوم. هەندێک شەو دەمبینی قسە لەگەڵ کەسێک دەکات، بێ ئەوەی کەس دیاربێت. چوم بۆ لای پزیشکی دەرونی لە دەرەوەی دورگەکەی خۆمان. ئامۆژگاری کردم کە ژنەکەم ببەم بۆ (دەکا). جارێکیان ویستی گەشتی بەلەمێک بوەستێنێت کە بەمەستی هاوسەرگیری دەچون بۆ دورگەیەکی دورتر. ئاگاداری کردنەوە ئەگەر گەشت بکەن، تۆفان بەلەمەکەیان نوقم دەکات، بەڵام ئەوان گوێیان نەدایە، چونکە ڕۆژێکی ساماڵ و خۆش بوو. شەو هەواڵی نوقم بونی بەلەمەکە و خنکانی هەموو سەرنشینەکانیمان پێگەیشت. لەو شەوەوە ئیدی لەگەڵی نەخەوتم. دورگەکەمان خەڵکی کەم لێبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو پێیان دەگوت جادووگەر.



ڕۆژێک خەریکی ماسیگرتن بووم، لەناکاو ژنەکەمم بینی لە ناو دوورگەیەکدا ڕادەکات. بڕوام بە چاوەکانم نەدەکرد، چۆن دەیتوانی بەبێ بەلەم بگاتە ئەوێ؟ بەپەلە بە بەلەمەکەم چووم بۆ لای، بەڵام کەسی لێ نەبوو. گەڕامەوە ماڵەوە و لەگەڵ خێزانەکەمدا زۆر بە شوێنیدا گەڕاین. شەو داهات و هەموو خەڵکی گوندەکە بە فانۆسەوە هاتنە دەرەوە و لەگەڵماندا کەوتنە گەڕان. بەڵام لە هیچ شوێنێک دیار نەبوو. بۆ هۆکاری دیار نەمانەکەی، خەڵکی هەر یەکە و شتێک دەڵێن. ئەوە دە ساڵ دەبێت دیار نەماوە، بەڵام هێشتا من گوێم لە دەنگی پێکەنینەکەیەتی و هەست دەکەم ڕۆژێک دابێت ئەو بێتەوە.

– ئیلو

تەنها دەمەوێت لە تاریکیدا بمێنمەوە. ئێستا شەرم لە ڕوناکی دەکەم.، بەڵام پێشتر وا نەبووم. کاتێک مێردەکەم من و منداڵەکانمی جێهێشت، من نەڕوخام. بەسەر هەموو مۆتەکەکانی ژیانمدا سەرکەوتم، بێ ترس شەڕم لەگەڵ هەموو تۆفانەکانی سەر ڕێگەمدا کرد. توانیم منداڵەکانم بە ڕشتنی خوێن و ئارەقم بەخێو بکەم. پێم وابوو کاتێک منداڵەکانم گەورە دەبن، من هەموو غەم و پەژارەکانم لە ناو دەچن و نامێنن، بەڵام کاتێک گەورە بوون. هەموو پەنجەی تۆمەتیان بۆ من درێژ دەکرد و پێیان دەوتم ئەگەر من ژنێکی باش بوومایە باوکیان جێی نەدەهێشتم. بۆ ئەوان من هیچ نەبووم جگە لە ژنێکی پیر، کە بارم بەسەریانەوە. منیان گواستەوە بۆ حەوشەی چێشتخانەکەی دەرەوە، بێ ئەوەی بنمیچێک هەبێت بمپارێزێت. بێ ئەوەی هیچ شتێک بە هیچ کەسێک بڵێم، ماڵەکەمم جێهێشت. ئێستا هەر جارێک و لە شوێنێک دەژیم، هەندێک جار لە ژێر درەختەکاندا دەخەوم. خەڵکی نەناس خواردنم دەدەنێ، لە کاتێکدا هەندێک جار منداڵەکانی خۆم ئامادە نەبوون خواردنم بدەنێ پێیان دەگوتم» بۆ پیرەکان خواردنی کەم باشە»



ئێستا من ناتوانم وەک جاران بچمە دەرەوە و بۆ خواردن بگەڕێم، چونکە تەنها ئەم پۆشاکەم هەیە کە لە بەرمدایە، ئەویش لە چەند شوێنێکەوە دڕاوە و کونی تێدایە. شەرم دەکەم بەم جۆرە بچمە دەرەوە. منداڵی بچوک دێن و پەنجە دەکەنە کونەکانەوە و دەیانەوێت زیاتر لەبەرمدا بیدڕێنن. تەنانەت بەم جلەشەوە نوێژەکانم دەکەم. کێ ئامادەیە جلم بداتێ؟ داوام لە چەند کەسێک کرد، بەڵام ئەوان تەنها پۆشاک دەدەن بە خزمەتکارەکانی خۆیان.

جارێک پیاوێکی دەوڵەمەند پۆشاکی دابەش کرد، منیش چووم و لە سەرەدا وەستام بۆ وەرگرتنی پۆشاک، بەڵام نەمتوانی هێندە لە ژێر تیشکی خۆردا بمێنمەوە، بورامەوە. من زۆر بەتەمەنم و بەرەو کۆتایی دەچم، بەڵام هێشتا شەرم دەکەم کە ناتوانم هەموو جەستەم داپۆشم.

– مریەم



به منداڵی کاتێک چومە قوتابخانە، بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان گوتی «سیرین چاوی زۆر جوانە.» دوای ئەوەی کە هاوسەرگیریم کرد و هاتم بۆ ئەم گوندە، مێردەکەم نەبێت هەموو پێیان دەگوتم کە چاوی من لە چاوی مار دەچێت. تەنانەت کاتی دوگیانیم، هەواڵی ئەوەیان بڵاوکردەوە کە ڕوحێکی شەڕەنگێز لە سکمدایە. چیتر کەس پێمناڵێت کە چاوم جوانە. دوای ئەو هەموو ساڵە تەنها لە زاری تۆوە گوێم لێبوو کەسێک پێمبڵێت چاوم جوانە...

– سیرین ٢٥، ساڵ

ڕۆژی خۆش ئەو ڕۆژەیە کە چاکەتێکی باشت دەست بکەوێت و بتوانیت چەند ساڵێک لەبەری بکەیت. یاخود بتوانیت خواردنێکی کەمێک بەسەرچووت دەستبکەوێت بەڵام هێشتا بۆ خواردن دەست بدات. لەگەڵ ئەمانەشدا ئەگەر بتوانیت پارچە یارییەکی شکاوت دەست بکەوێت تا لەگەڵ سەگەکەت یاری پێبکەیت هەر باشە. ئەمڕۆ یەکێکە لەو ڕۆژە خۆشانە بۆ من ...

- شیۆلو، منداڵێکی بێ لانە کە لە زبڵخانەکاندا دەمێنێتەوە.



درکم بەوە کرد کە کچەکەم پێنج ساڵە پەیوەندی لەگەڵ کوڕێکدا هەیە. هەرگیز باسی نەکردبوو لام، چونکە هەمیشە لە من دەترسا. هەستیشم کردبوو کە هەمیشە منداڵەکانم ڕقیان لە کارەکەم بوو، کارێک کە لە منداڵییەوە تا ئێستا وازم لێ نەهێناوە. ڕۆژێک داوام لێکرد کە کوڕەکە و بنەماڵەکەی بانگێشت بکات بۆ ماڵەوە. هەموو ماڵەکەم نوێ کردەوە و دیکۆر و ڕەنگەکەیم گۆڕی و باشترین خواردنم کڕی. بیست ساڵ بوو پارەم بۆ هاوسەرگیری کچەکەم کۆدەکردەوە. ئەو ڕۆژە کچەکەم لە هەر ڕۆژێک دڵخۆشتر بوو.

کاتێک نان خورا و قسە دەستپێکرد، وەک مەرجی هاوسەرگیری، داوای هەموو ئەو شتانەیان کرد کە ماڵ پێویستی پێیەتی. هەرچ وشەیەک ئەوان دەیانگوت، من لە دڵی خۆمدا دەمژمارد و سەری بەڵێم بۆ دەلەقاندن. چونکە لە پێناو بەختەوەری کچەکەمدا بوو، بە هەموو شتێ قایل بووم.

دواجار گوتیان کە نایانەوێت من بە خزم و کەس و کاریان بناسێنن و پێویستە هەرگیز سەردانی کچەکەشم نەکەم. کە وایان گوت، کچەکەم بە توڕەبوونەوە قیژاندی و زللەیەکی لە کوڕەکە دا. بە توڕەییەوە پێی گوتن «ئەو کارەی باوکم دەیکات کەس بۆی ناکرێت. هەموو ئامادە نین پیسی ئەوانیتر پاک بکەینەوە. من شانازی بە کارەکەی باوکمەوە دەکەم، ئەگەر لە یەک خولەکی تردا لەم ماڵە نەچنە دەرەوە، ئەوا هەمووتان لێدان دەخۆن.»

سەرجەم داواکاری هاوسەرگیری و پێنج ساڵ پەیوەندی لە یەک خولەکدا هەڵوەشاندەوە. لەو ڕۆژەوە زانیم من چەند بەختەوەر و چەندە دەوڵەمەندم ...

- مۆنو لال



من وەک تۆ کامێرام نیە، بەڵام دەتوانم زۆر شت بکەم. دەتوانم ناوی خۆم بنوسم. دەتوانم هەموو شتێک بخوێنمەوە. دەتوانم چەندین کاتژمێر لە ناو گۆمدا مەلە بکەم. بە داهاتەکەم، خوشکە بچکۆلەکەم دەنێرم بۆ قوتابخانە، بەڵام باشترین شت کە دەتوانم بیکەم ئەوەیە کە دەتوانم هەموو کەسێک بخەمە پێکەنین، لە چەند خولەکێکدا. پێم ناخۆشە کەسێک لە نزیکمەوە بێت و بێتاقەت و دڵتەنگ بێت. حەزم لە دەنگی پێکەنینە. پاش ئەوەی کە بە قسە خۆشەکانمەوە دەگەڕێمەوە ماڵەوە، دایکم زۆر دڵخۆش دەکەم. وەک کچێکی بچوک پێدەکەنێت. من زۆر دڵخۆشم بە بینی ئەوە. خەم هەرگیز لە من نزیک نابێتەوە. *من لە دڵخۆشی دروستکراوم...*

– ئیسماعیل، ١٤ ساڵ



هەرگیز لە خەونیشدا پێم وانەبوو بەرەوڕوی ئەم شەرمەزارییە دەبمەوە. دوای ئەوەی کە لە لادێوە هاتم بۆ ئێرە، لە ماڵێک بووم بە خزمەتکار و سێ منداڵەکەشمم نارد بۆ ماڵان بۆ کارکردن. چوار ساڵ بەر لە ئێستا، وەک هەر ژنێکی تر خاوەنی ماڵ و مێرد و بەختەوەری بووم. کچە گەورەکەم و مێردەکەی لەتاو نەبوونی لەگەڵ ئێمە دەژیان. مێردەکەم زۆر ئەو کچەی خۆشدەویست، بەڵام هەرگیز پێم وانەبوو ئەو خۆشەویستییە تۆفانێک لەگەڵ خۆی دێنێت و هەرچیم هەیە و نییە لەگەڵ خۆی دەیبات. دوای ئەوەی کە مێردەکەم کۆچی دوایی کرد، کچەکەم وەسێتنامەیەکی پیشاندام کە مێردەکەم ئیمزای کردبوو و خانوەکەمانی کردبوو بە ناوی کچەکەمەوە. توشی شۆک بووم و نەمدەتوانی بڕوا بکەم. ژنەکەم و مێردەکەی زۆریان لێداین و پاشان من و منداڵەکانمیان کردە



دەرەوە. بڕوا ناکەم چۆن کچەکەم توانی ئەوە لەگەڵ ئێمە بکات! تەنها لە پێناوی خانویەکدا! هەموو ڕۆژێک لەگەڵ ئەو ئازارە دەژیم. کاتێک کچەکەم لێی دەدام، دەیکێشا بە ڕەحممدا. ڕەحمێک کە ئەوی هێنایە دونیاوە ...

٠ ڕینا ئەکتێر، ٤٥ ساڵ

*ڕۆژێک باوکم لە کار نەگەڕایەوە.* هەموو شوێنێکی بۆ گەڕاین. چووین بۆ نەخۆشخانە، چەند ڕۆژێک بە ڕێی بنکەی پۆلیسەوە بووین، بەڵام هیچ سۆراغی نەبوو. دوو برای بچوکم هەبوو، ئەوان نەیاندەزانی چی ڕوویداوە. دوای ساڵێک لە دیارنەمانی، هەموو خەڵکی پێیان دەگوتین کە باوکم لەگەڵ ژنێکی دیکە هەڵهاتووە. بە تێپەڕبوونی کات، مامەڵەی دایکم خراپ و خراپتر دەبوو لەگەڵمان. ڕۆژێک لە تەوالێتەکەدا زیندانی کردم بە تەنها، لە کاتێکدا دەیزانی کە چەندە لە تاریکی دەترسم. *بەیانیەک خەبەرم بووەوە و بینیم دایکم دیارنەماوە.* ئەویش لەگەڵ (تووەو) ئێمەی جێهێشتووە. من یازدە ساڵ بووم دوو براکەشم بەردەوام دەگریان، سەرم لێ شێوابوو نەمدەزانی چی بکەم. دوو ڕۆژمان تێپەڕاند بێ خواردن و بێ هاوکاری. دوای پاڕانەوەیەکی زۆر، خەڵکی گوندەکە لەگەڵ خاڵم و پورم و نەنک و باپیرم کۆبوونەوە. بنەماڵەکەم قایلبوون بەوە دوو براکەم وەربگرن و منیش بنێرن بۆ ماڵێک وەک خزمەتکار کار بکەم لە «دەکە». بنەماڵەکەم پێیان وابوو من هۆکاری سەرجەم ئەو شتانەم کە ڕوودەدەن.

لەسەر ڕێگەی «دەکە»، ئەو ژنەی لەگەڵم بوو و پێویست بوو ماڵەکەم پیشان بدات، گوێم لێ بوو بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ کەسێک دەکرد و نرخی منی پێ دەگوت. نەمزانی ئەوە کێیە و بە کێم دەفرۆشێت، بەڵام ئەوەم زانی کە دەبوو هەڵبێم. بۆیە خشتێکی گەورەم هڵگرت و دام بە سەریدا و هەڵهاتم. ئەو خوێنێکی زۆری لێ دەڕۆیشت، بەڵام بێ ئەوەی ئاوڕ بدەمەوە هەڵهاتم. ئەم زەوییە شوێنێکی زۆر خراپە، بەڵام فێر بووم چۆن بژیم...

– نارگیز،
١٢ ساڵ



من براکانم بەخێودەکەم. دەبێت خوێندن تەواو بکەن. هەموو ڕۆژێک برنج و پەتاتە دەخۆم. *ئەوە بۆ ١٠ ساڵ دەچێت ئەمە خۆراکی منە*. نامەوێت پارە لە کڕینی ماسی و سەوزەدا بەفیڕۆ بدەم. لەبەر ئەوەی دەمەوێت هەموو پارەکانم لە پێناوی ئەواندا خەرج بکەم. ئەوان زۆر بچوکبوون کە دایک و باوکم لە ڕوداوێکدا کۆچی دواییان کرد. لەو ڕۆژەوە من دایک و باوکی براکانمم.

لە قوتابخانە، مامۆستا داوای لە برا بچکۆلەکەم کردبوو تا داڕشتنێک لە بارەی خێزانەکەیەوە بنوسێت، ئەویش نوسیبوی: براکەم دایک و باوکمە ههههاهههههااا بۆ ئەمەش سێ لە دە-ی هێنا. *ئامادە نیە ئەو هەڵەیە ڕاستبکاتەوە تەنانەت ئەگەر سفریش بهێنێت.*

ئەوان ژیانی منن. ئامادەم لە پێناو بەختەوەری ئەوان، بە درێژایی هەموو ژیانم ئەم خواردنە بخۆم.

- ڕەیهان



باوکم زۆر ڕەزیل بوو. ئەم ڕەزیلییە من و دایکمی بێزار و بێتاقەت کردبوو. هەر کات داوام لێدەکرد چوکلاتەم بۆ بکڕێت، هەمیشە دەیگوت «ئێستا نا، سبەی بۆت دەکڕم». ئەو سبەینێیەش هەرگیز نەدەهات. هەرگیز هیچ بڕە پارەیەکی نەدەدا بە هەژاران، تەنانەت نەیدەدا بە ئێمەش. من و دایکم هەوڵماندا ئەم هەڵسوکەوتەی بگۆڕین. ڕۆژێک چوو بۆ شار. بڕیار وابوو ڕۆژی دواتر ئێوارەکەی بگەڕێتەوە. ئەو شەوە من و دایکم هەندێک پارەمان لێ دزی. بەو پارەیە خواردنمان بۆ سەدەها کەس کڕی. بە ناوی باوکمەوە، کەسە هەژارەکانی گوندەکەمان بانگهێشت کرد بۆ ژەمێکی نانی نیوەڕۆ. کاتێک هەموو نانی نیوەڕۆیان دەخوارد، باوکم گەڕایەوە. هەموو سوپاسیان کرد و تەنانەت هەندێکیان دەستیان کرد بە گریان. باوکم زۆر سەری سوڕما، هیچ قسەیەکی نەکرد.



ڕۆژی دواتر کاتێک باوکم چوو بۆ بازاڕ، هەموو بەرەو ڕوی دەهاتن و بە میهرەبانیەوە دەستیان دەگوشی و سوپاسی میهرەبانییان دەکرد. بینیم ڕوخساری باوکم دەدرەوشێتەوە. کە گەیشتینەماڵەوە، من و دایکمی بانگ کرد و پێیگوتین «هەرگیز پێموانەبووە بەخشینی پارە بۆ خەڵکی، هێندە دڵخۆشکەربێت. لەبەر ئەوە لێتان خۆشدەبم بۆ دزینی پارەکانم».
ئەوەت پێبڵێم کە دزینی پارەکە، بیرۆکەی من بوو. من کوڕێکی زیرەکم...

- حسێنی زیرەک

دایکم و باوکم هەمیشە لەسەر پارە شەڕیان بوو. ئێمە شەش منداڵ بووین. دایکم هیچ ئیشی نەدەکرد، تەنها چاوەڕوانی دەستی باوکم بوو. هەرچی باوکم بۆ خواردن نەیهێنایەتەوە ئەوا نەمان بوو. دایکیشم هیچ یارمەتی خێزانەکەی نەدەدا و ئیشی نەدەکرد. شەڕەکانیان بەرەو خراپتر چوو و وای لێهات لە یەکیان دەدا و بە چەندین ڕۆژ قسەیان لەگەڵ یەک نەدەکرد. هەرگیز نەم دەبینین قسەی خۆش بکەن یان پێکەوە پێبکەنن. هەردووکیانم خۆش دەویست. دەمبینی باوکم هەموو ڕۆژەکانی ساڵ شازدە کاژێر کاری دەکرد، بە ڕۆژانی جەژنیشەوە، بەلام دایکم هیچی نەدەکرد و تەنها لە ماڵەوە دەمایەوە. باوکم لە شەست ساڵیدا کۆچی دواییکرد. لەسەر جێگەی مردنەکەی باوکم، دایکم دەستیکرد بە سەرزەنشتکردنی باوکم و دەیگوت ئێستا چۆن بژیم لە کاتێکدا ئەو هیچ پارەیەکی پاشەکەوتی بۆ جێنەهێشتووم.
کاتێک منیش هاوسەرگیریم کرد، منیش ژنی ماڵەوە بووم و کارم نەدەکرد. لە دوای ساڵێکی هاوسەرگیری وام لێهات ، هەمان سیفەتەکانی باوکمم لە مێردەکەمدا دەبینییەوە. مێردەکەم دەبینی چەندە ماندوو دەبێت و ڕەنج دەکێشێت تا بە منەوە پێنج ژن بەخێوبکات، بێ ئەوەی هیچیان کار بکەن. هەموو شەوگارەکانی بە ئازاری قاچەوە تێدەپەڕاند و وای لێهات بە بچوکترین شت تورە دەبوو. بۆ ڕزگارکردنی مێردەکەم لەو دۆخە، بێ ئەوەی داوام لێبکات، من خۆم دەستم کرد بە کارکردن. بۆ ئەوەی هەمان هەڵەی دایکم و نەنکم دوبارە نەکەمەوە، پێویست بوو کار بکەم. ئێستا هەردووکمان هێندەی یەک پارەمان دەست دەکەوێت و ئەرکەکانی ماڵمان بە یەکسانی بەشکردووە. ئێستا ئەویش وەک من ئیشی ناو ماڵ دەکات و ئاگای لە منداڵەکان دەبێت. هەرگیز باوکمم نەبینی ئەو شتانە بکات. ئێستا هێندە پاشەکەوتم هەیە بتوانم هاوکاری دایکم و خوشکەکانمی پێ بکەم. مانگی پێشوو سەلاجەیەکم کڕی، چونکە دەزانم مێردەکەم چەندە حەزی لە ئاوی ساردە. بە کارکردن، ژیانی خۆم و ژیانی هاوسەرگیریشمم ڕزگار کرد...



- دیلارا



(تێبینییەک لەسەر ئەم فۆتۆیە: پاری، سەرەتا لاقە کرابوو، دواتر کوژرابوو و بە دارەکەوە هەڵواسرابوو. کاشیم کە چیرۆکەکەی گێڕایەوە ئاماژەی بەوە نەدا. بۆیە منیش لە چیرۆکەکەدا نەم نوسی، بەڵام لەبەر ئەوەی چەند کەسێک لە چیرۆکەکە تێنەگەیشتبوون، فۆتۆگرافەر ناچار بوو ئەم تێبینییە لە کۆمێنتێکدا بنوسێت.)

کارم ئەوە بوو بگەڕێم و هەنگوین بدۆزمەوە. هەرگیز نە لە پڵنگ و نە لە تیمساح نەدەترسام. کچێکی زۆر جوانم هەبوو، ناوی پاری بوو. کچەکەم وەک تاوس سەمای دەکرد. لە شاژنی دارستانەکە دەچوو. هەموو ئێوارەیەک کە لە کار دەگەڕامەوە، لە دارستانەکەدا چاوەڕوانی دەکردم. بە منداڵی و دڵپاکی و میهرەبانیەکەی، دەیتوانی دڵی هەموو کەسێک بەدەست بهێنێت. ئەو منداڵ بوو کە دایکی کۆچی دوایی کرد. لە پاش دایکی، ئیدی ئەو لە گۆ کەوت و چیتر نەیتوانی قسەبکات. لەبەر ئەوەی کە هەژاربووم، نەمتوانی بیبەم بۆ نەخۆشخانە و چارەسەری بکەم. *تا ئێستاش پێکەنینەکانیم لەبەر چاوە*. بەو پێکەنینانەی، هەموو خەم و ئازار و ماندووبوونەکانمی دەڕەواندەوە.

ڕۆژێکی باراناوی بوو، گەڕامەوە ماڵەوە. وامزانی چاوەڕوانم دەکات، بەڵام لە هیچ شوێنێک دیار نەبوو. بیست خولەک بەشوێنیدا گەڕام، دواجار بە مردوویی دۆزیمەوە، بە دارێکەوە هەڵواسرابوو. جلەکانی بەری دڕابوون. کە من گەیشتم ئەو کۆچی کردبوو. لە تورەییدا هاوارم دەکرد و دەمقیژاند. دەمویست هەرچی دێتە بەردەستم بیکوژم. ئێستا هەموو ئێوارەیەک لەو دارستانەدا پاسەوانی دەکەم، بۆ ئەوەی هیچ کەسێکیتر وەک من کچەکەی لەدەست نەدات...

– کاشیم



من کە یەکەم جار ئەم سەگەم بینی، لەسەر شەقامێکی جەنجاڵ بوو. دەیویست لە شەقامێک بپەڕێتەوە، بەڵام هیچ ئۆتومبیلێک ڕێگەی نەدەدا بپەڕێتەوە. من لەوبەری شەقامەکەوە بووم. سەگەکە دەترسا و هەر ڕاست و چەپی بوو. چەند جارێک ئاماژەم بۆ کارمەندی هاتوچۆکە کرد، بەڵام گوێی پێ نەدام. زۆر لەوە دەترسام ئۆتومبیلێک لێیبدات. *شۆفێری پاسێکی بچکۆلەم بینی کە پێدەکەنێت و بەرەو سەگەکە ڕۆیشت تا بیکات بە ژێرەوە.* بۆیە وەک شێت ڕامکرد و خۆم بۆ هەڵدا و بێ گوێدانە هیچ ڕوداوێک، لە شەقامەکەم دوورخستەوە. من و سەگەکە کەوتینە بەردەم کارمەندی هاتوچۆکـە. هەڵی ساندمەوە و پەنجا تەکەی دا پێم تا شتێکی خواردنی پێ بکڕم. پێکەوە چوین سەمونی پڕ لە پەنیرمان خوارد. لەو ڕۆژەوە من و سەگەکەم (شێرشاهـ) پێکەوە دەژین.

– ساجو، منداڵێکی سەر جادە

نامەوێت بڕوا بەوە بهێنم کە هەموو شتەکان بەستراونەتەوە بە چارەنوسەوە. من کچێکی زۆر ئاساییم. ڕەنگە وەک کچانی شار ژیر نەبم و هیچ بەهرەیەکم نەبێت، بەڵام لە ناخمدا هێزێکی زۆرم هەیە. لە دورگەکەی ئێمە نە نەخۆشخانەی لێیە و نە بنکەی تەندروستی. هەموو ژنەکان پشت بە ئەزمون و قسەی ژنێکی بەتەمەن دەبەستن. هەندێک جار کاتێک سێ ژن پێکەوە ژانی منداڵبوون دەیانگرێت، ئەو لە یەک کاتدا بە هەموویان ڕاناگات. بینیومە ژنی دووگیان و منالّی کۆرپە چەندە ئازار دەچێژن و تەنانەت بینیویشمە کە دەمرن. لەبەر هەموو ئەمانە، دوای ئەوەی کە فێری چەند شتێک بووم، دەستم کرد بە سەردانکردنی ژنە دوگیانەکان و کەوتمە هاندانیان تا لە ڕوبارەکە بپەڕنەوە و سەردانی پزیشک بکەن لە کاتی حاڵەتی لەناکاودا. دوای چەند مانگێک لە هەوڵدان، ئێستا خاوەنی بەلەمێکین کە ژنی دووگیان و ئیمیرجنسی دەگوازێتەوە بۆ نەخۆشخانە، بەڵام ئەمە هەموو ئەو شتانە نییە کە من دەمەوێت. من زۆر لەوە زیاترم دەوێت. من دەمەوێت ببم بە پزیشک تا هاوکاری خەڵکی دورگەکەم بکەم و ببم بە بڕبڕەی پشتی دورگەکەم.

- ڕومی



چوار ساڵ لە من گەورەتر بوو. ڕەشپێست بوو، لەگەڵ ئەوەدا هێندەی پاڵەوانی ناو چیرۆکە ئەندێشەییەکان جوان بوو. ناخی بە جۆرێک جوان بوو، نەدەپەرژامە سەر تەماشاکردنی ڕوخساری. *لە ژیانمدا کەسم نەبینیبوو هێندەی ئەو خەمخۆربێت.* هەرچ ژنێکی گوندەکە نەخۆش بکەوتایە، ئەم دەبوایە بچێت بۆ لای. لە گوندەکەی ئێمە، ژنان زۆر بە کەمی دەچوون بۆ نەخۆشخانە. ئەم لە لای هەموو ژنە دووگیانەکان دەمایەوە و ئێشکی دەگرت. *لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، خەڵکی گوندەکە زۆر بە خراپ باسیان دەکرد.* هیچ کەس ئامادە نەبوو هاوسەرگیری لەگەڵ بکات. منیش هەر لە منداڵیمەوە شەیدای ئەو ببوم. ڕۆژێک هەموو ئازایەتی خۆمم کۆکردەوە و هەموو هەستەکانی خۆمم بۆ دایکم باسکرد. خۆشبەختانە دایکم هەموو شتێکی کرد، تا حەسنا بکات بە هاوژینم.

ئێمە دڵنیابووین لەوەی کە هیچ کەس لە ئاهەنگەکەمان ئامادە نابێت، بەڵام ڕۆژی ئاهەنگەکە، زۆر چاوەڕوان نەکراوانە سەدەها ژن ئامادە بوون. لە هەموو گوندەکانی دەوروبەرەوە هاتن تا لای ئێمە ئامادەبن. ئەوکات زانیم کە هەموو ئەو ژنانەی فێری نوسین و خوێندنەوە کردووە.

سێ ساڵ بەر لە ئێستا ژنەکەم کۆچی دواییکرد. هیچ منداڵێکمان نەبوو. *بۆ من، خۆشەویستی ئەو هەموو شت بوو.* دوای کۆچی ئەو، سەرجەم ئەو زەوییەی کە هەمانبوو، بەخشیم بە خێرخوازان تا قوتابخانەیەکی کچانی لەسەر دروستبکرێت. دڵنیام بەم کارەی من، ئەو لە بەهەشتەوە دڵی خۆشبووە و پێکەنیووە...






دایکم نەخۆشە و ناتوانێت نان بخوات. حەزی لە هیچ خواردنێک نیە، گۆشتی مانگا نەبێت. هەرکاتێک گۆشتی مانگامان هەبێت، ئەو ژەمە نانی باش دەخوات. منیش پارەم پێ نییە تا بتوانم هەمیشە گۆشتی بۆ بکڕم، چونکە زۆر گرانە. ئەمە واناکات تا من لە کڕینی گۆشت بوەستم، چونکە هەموو ڕۆژێک دە تەکە وەردەگرین بۆ نانی ئێوارە، منداڵەکانی دیکە نانی پێ دەکڕن، بەڵام من ئەو پارەیە هەڵدەگرم و کۆی دەکەمەوە. شەش ڕۆژ پارە کۆدەکەمەوە، لە ڕۆژی حەوتەمدا، دەتوانم نیوکیلۆ برنج و گۆشتی مانگا بکڕم و بۆ دایکمی ببەمەوە.

کاتێک لە بەردەممدا نان دەخوات و پێمدەڵێت «بابو تامی ئەم گۆشتە زۆۆۆر خۆشە» ئیدی من وا دەزانم هەرچی خواردنی دونیا هەیە لە ناو سکی مندایە...

– بابو، ١٣ ساڵ

چەند ڕۆژێک بەر لە ئێستا کچەکەم هات بۆ سەردانم. چاوەکانی سور ببوونەوە و زۆریش گریابوو. بینیم دەستی و ملی لە چەند شوێنێک سووربوونەتەوە. ئەو دڕندەیەی مێردی لێیدابوو. کچەکەم وەک بوکەشوشەیەک وەهابوو کە دام بە شوو بەو دڕندەیە. دوو مانگا و بڕێک پارەم دا پێی وەک شیربایی. خەڵکی گوندەکە هەموو پێیان دەگوتم کە پاراستنی ژیانی هاوسەرگیری کچەکەم، ئەرکی منە و دەبێت کچەکەم بنێرمەوە بۆ لای مێردەکەی، بەڵام دوێنێ هەنگاوێکی دیکەم نا. چوم بۆماڵی مێردەکەی و زۆرم لێدا، بەبەرچاو هەموو ئەو خەڵکەوە بە بۆکس کەوتمە دەموچاوی. دواتر کچەکەم و منداڵەکانیم هێنایەوە و هاتمەوە. بڕیارمدا گرنگی بە ژیانی کچەکەم بدەم و قسەی کۆمەڵگا پشتگوێ بخەم، بەڵام ئەم بەیانییە کە خەبەرم بووەوە، بینیم منداڵەکانی بردۆتەوە و چووەتەوە بۆ لای مێردەکەی. بەر لە ڕۆیشتنەوە *بە براکانی گوتووە کە نایەوێت ببێت بە بارێک بەسەر شانمەوە چونکە دەزانێت چەند هەژارین.*

– ئەبو تاهر، ٦٥ ساڵ



دوانزده ساڵ بەر لە ئێستا خێزانەکەم لە گوندەکەیان هەڵهاتن. هەر لە منداڵییەوە، هەمیشە پرسیارم لە دایکم دەکرد دەربارەی نەنک و باپیرم و شوێنی نیشتەجێبوونیان. دایکم هەموو کات سەرزەنشتی دەکردم لەسەر ئەو پرسیارانە. لە کاتێکدا باوکم هانی دەدام بۆ کردنی هەموو جۆرە پرسیارێک، بەڵام دایکم هیچ وشەیەکی نەدەگوت.

ڕۆژێک خێزانەکەمان لە ناو کێڵگەیەک کاریان دەکرد. من بە تەنها لە کوخەکەمان بووم. ژنێکی پیر هات بۆ کوخەکەمان. پێیگوتم کە ئەو نەنکی منە. منی زۆر بەرز وەسفدەکرد، لە کاتێکدا زۆر قسەی بە دایکم دەگوت و بەنەفرەتی دەکرد. دواتر لەوە تێگەیشتم کە دایکم لەسەر دینی هیندوە. باوکیشم موسوڵمانە. هەردووکیان هاوڕێی منداڵی بوون. دواتر گەورەببوون و کەوتبوونە خۆشەویستیەوە. کاتێک باوکم هەستی بەوە کردبوو کە خەڵکی گوندەکە دەیانەوێت دایکم ئازار بدەن، هەردووکیان پێکەوە لە گوندەکە هەڵهاتبوون. زۆر دڵخۆش بوون ئەو کاتەی دایکم و باوکم لە کێڵگەکە گەڕانەوە، چونکە پێموابوو نەنکم هاتووە تا بمانباتەوە بۆ ماڵەوە.

کاتێک دایکم چوو بەرەو لای نەنکم، نەنکم لێی دوورکەوتەو و گوتی «هاتووم تا کوڕ و کوڕەزاکەم ببەمەوە بۆ ماڵەوە.» باوکیشم داوای لە نەنکم کرد کە بە تەنها بگەڕێتەوە بۆ گوندەکەیان و پێشی گوت کە هیچ کەس لەگەڵی ناڕوات.



لە کاتی ڕۆشتنیدا، نەنکم لێی پرسیم « تۆ لە سەر چ دینێکیت؟» منیش وەک ئەوەی دایکم و باوکم فێریان کردبووم، ڕاستەوخۆ گوتم «خۆشەویستی»...

– موتەڵیب

هەندێک جار دەچم سەرێک لە ژنە کۆنەکەم دەدەم، چونکە هیچ کەسێکی دیکەم نیە بچم بۆ لای. هەموو پێم دەڵێن کە ئەو ژنێکی خراپە، بەڵام من دەزانم ئەو بە چ بارودۆخێکدا تێپەڕیوە، بۆیە هەرگیز بۆ یەک چرکەش لۆمەیم نەکردووە. نەمدەتوانی تەنانەت جلیشی بۆ بکڕم، لەگەڵ مندا برسێتیەکی زۆری چەشت. گوێم لێ بوو چەندین شەو دەگریا. تەنها یەک منداڵمان هەبوو، بەڵام لەدەستماندا و کۆچی دواییکرد، لەبەر ئەوەی من پارەم نەبوو چارەسەری



بکەم. هەر کات سەردانی دەکەم، شیرینیم دەداتێ، لە ژورەتازەکەی هەمیشە شیرینی لایە. بیریشی نەچۆتەوە من چەندم حەز لە شیرینییە. ڕەنگە ئێستا بەختەوەرتر بێت. ژیانمان زۆر جیاواز دەبوو ئەگەر بمتوانیایە منداڵەکەمان چارەسەر بکەم.

هەرگیز لۆمەی مۆنیا ناکەم لەبەر ئەوەی منی جێهێشتووە و ئێستا لە سۆزانیخانەیەک ئیش دەکات. هەموو پێی دەڵێن سۆزانی، بەڵام بۆ من ئەو هێشتا هەر ژنە نازدارەکەی خۆمە ...

– کۆمیش، ٤٥ساڵ

هەموو پێم دەڵێن کە من کوڕێکی زیرەکم، خۆشم پێموایە زیرەکم. دەتوانم «کۆمپیوتەر بەکاربهێنم. دەتوانم هەموو لێکدانەوەیەکی بیرکاری زوو ئەنجام بدەم. زۆر شتیش لەسەر گەردوون دەزانم، بەڵام یەک مەرجم هەیە. ئەویش ئەوەیە کە من وەڵامی هیچ پرسیارێکت نادەمەوە، هەتا چوکولاتەیەکم نەدەیتێ ها ها ها»



تەلهە،٨ ساڵ
خوێندکاری پۆلی دووەم

حەڤدە ساڵ بووم کە ئاشق بووم. ئەو پازدە ساڵ بوو. کاتێک دایک و باوکی بە پەیوەندیەکەیان زانین، ویستیان بەزۆر بیدەن بە شوو بە پیاوێکی دەوڵەمەندی پەنجا ساڵ. دەبوایە ئەم ببێت بە ژنی سێهەمی پیاوەکە. بۆیە پێکەوە لە گوندەکە هەڵهاتین و لە گوندەکەی دراوسێمان کوخێکم دروستکرد و تێیدا ژیاین. هەژار بووین، نانمان نەبوو بیخۆین. جارێکیان لە وەرزییێکی باراناویدا ڕۆژ بێ نان لە ژێر باراندا ماینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەختەوەربووین. هەمیشە پێیدەگوتم « خۆشەویستی تۆ تێرم دەکات». دوای ماوەیەک ئەو سکی هەبوو، بەڵام وەک هەمیشە هەم برسی و هەم دڵخۆشیش بووین، بەڵام هەرچۆنێک بوو هەوڵمان دەدا لەگەڵ دۆخەکە بگونجێین. ساتی منداڵبوونەکەی، بەپەلە کردمە باوەشم و فڕاندم بۆ نەخۆشخانە. پزیشکەکە گوتی کە زۆر پێویستی بە خوێنە. منیش تەنها سێسەد تەکەم لە گیرفاندا بوو. بۆیە بە گریانەوە دانیشتم و چاوەڕوانی ڕودانی پەرجویەکم دەکرد. پزیشکەکە توانی هەندێک پارە و خوێنمان بۆ پەیدا بکات. دڵنیابووم کە لەمە ڕزگاری دەبێت و شتەکان وەک جارانیان لێ دێتەوە. دوای چەند کاتژمێرێک لە هەوڵدان، پزیشکەکە هاتە دەرەوە بۆ لام، و وتی «..............» لەیادم نییە چی گوت.

ژنەکەم بە تەنها جێیهێشتم، خۆی و منداڵەکەشمان کۆچی دواییان کرد. گەڕامەوە بۆ لادێ، کوخەکەمانم ڕوخاند، هەموو شتەکانم تێکدا. هەموو ئەو شتانەی پێکەوە هەمانبوو، لەناومبردن. لەو ڕۆژەوە لە ژێر ئاسمانی روتدا دەخەوم.

بە تەنها ناخەوم، لەگەڵ یادگارییەکانی ئەودا دەخەوم...

– ڕەسیل، ٢٠ ساڵ برینەکانی دڵی خۆی بۆ کردینەوە و باسی خۆی و نوپوری خێزانی بۆ کردین.



من دەمەوێت دایکم دڵخۆشبێت. دڵخۆشی دایکم نەبێت، هیچ شتێکی دیکەم ناوێت لە دونیادا.
لەو ڕۆژەوەی کە باوکم لە پێناوی ژنێکی دیکەدا ئێمەی بەجێهێشت، پێکەنین و بزەکانی دایکم کۆتاییان هات. بەڵام من دڵنیام کە ڕۆژێک دەتوانم ئەو بزەیەی بۆ بگێڕمەوە.
لەبەر ئەوە هەموو ڕۆژەکانم بە ڕاوەماسییەوە دەگوزەرێنم، چونکە دەزانم ئەگەر ماسییەکی گەورە بگرم، ئەوا دایکم دڵخۆش دەبێت. لەیادمە چەندە دڵی خۆش دەبوو کاتێک باوکم ماسییەکی گەورەی ڕاودەکرد و دەیهێنایەوە ماڵەوە...

– شۆهاگ، ١٠ ساڵ



ئێمە کۆمەڵێک کەسین لە ناو شاردا بە عارەبانەکانمان خەڵکی دەگوێزینەوە. من ژیانم زۆر خۆشە، نە نەخۆشی دڵم هەیە، نە نەخۆشی گورچیلە. ئێمە جەستەمان بەهێزە و زۆر ئیشی قورسمان پێدەکرێت. کاتێک دەچینەوە ماڵەوە و نان دەخۆین، خواردنەکان لە دەممماندا زۆر بەچێژن. هیچ کێشەی خەوتنیشمان نیە. ئەگەر دەسەڵات وازمان لێبهێنێت بتوانین بە هەموو کوچە و کۆڵانەکاندا بڕۆین و کاری خۆمان بکەین، ئیدی ژیانمان هیچ کێشەیەکی تێدا نەدەبوو...

– ئیدریس، ٢٨ ساڵ



یەک لە دوای یەک منداڵمان دەبوو کەچی هەموو هەر کچ بوون. هەموو جارێکیش من هەر چاوەڕوانی کوڕێک بووم. بیرم دەکردەوە ئەگەر کوڕم نەبێت، کێ ناوی من هەڵدەگرێت؟ لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، من هەر چوار کچەکەمم بە یەکسانی خۆشدەوێت.
من سەوزەفرۆش بووم. هەموو ڕۆژێک دەمبینی کە چۆن کوڕەکان کاری قورسیان دەکرد و شتی قورسیان بۆ باوکیان هەڵدەگرت. ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بێ هیوا دەبووم. دوای چاوەڕوانییەکی زۆر، لە کۆتاییدا بووم بە خاوەنی کوڕێک. ئاهـ چەندە بەختەوەر بووم! چەندە شانازیم بە خۆمەوە دەکرد! بەڵام ئێستا دەترسم، شەرمەزارم، هەموو ڕۆژێکی ژیانم لە شەرمەزاریدا دەژیم. کاتێک هاتیت قسەم لەگەڵ بکەیت، من ترسام. ترسام لەوەی پارەت لێ



بدزێت. ماددەی هۆشبەر هەموو هەستە مرۆڤانەکانی ناخی ئەوی لەناو بردووە. هاوسەرگیری کچە بچوکەکەم هەڵوەشایەوە، چونکە ئەو لە ڕۆژی هاوسەرگیرییەکەیدا هەموو ئاڵتونەکانی خوشکەکەی دزی. من هێندە کوێرانە خۆشم دەویست، هەموو درۆکانیم پشتگوێ دەخست و چاوم لە هەموو هەڵەکانی دەپۆشی. خۆشەویستیە کوێرانەکەم، ژیانی کوڕەکەمی وێران کرد. ئێستا هەست بە تاوان دەکەم، هەست دەکەم باوکێکی باش نەبووم و بەرپرسیارییەتییەکانم بە ئەنجام نەگەیاند.

– مۆنتاج، ٥٦ ساڵ

دایکم زۆر حەزی لە گوڵی باکوڵ-ە. بۆیە ناوی نام باکۆڵ. دایکم هەمیشە پێمدەڵێت کە هەژارەکان نابێت خەون زۆر ببینن، پێمدەڵێت کە هەژارەکان تەنها دەبێت زەحمەت و ئازار بچێژن. هەندێ جار بیر دەکەمەوە ئایا ئەوە خودایە کە ئازارچەشتنی بۆ هەژارەکان و خۆشبەختیشی بۆ دەوڵەمەندەکان داناوە! جارێک ئەمەم لە دایکم پرسی، ئەویش بە تورەبونەوە ڕەخنەی لێگرتم و پێیگوتم کە خودا هەمووومانی بە یەکسانی خۆشدەوێت لە هەرچ ئاستێکدابین.



دوێنێ شەو لە خوا پاڕامەوە کە عەزییەکی نوێم بۆ بنێرێت. زۆر چاوەڕوانم کرد، هیچم پێ نەگەیشت. ڕەنگە خوا کاتێکیتر عەزییەکەم بۆ بنێرێت. خۆی دەزانێت چەندە حەزم لە عەزییەکی تازەیە.

- باکول، ١٢ ساڵ

کێشەیەکی سەیرم هەیە. شتم لە یاد دەچێتەوە. تەنانەت هەندێک جار ناوی خۆشمم بیر دەچێتەوە. لەو کاتەوەی نەخۆشکەوتووم، براکانم بەخێوم دەکەن و ئاگایان لێم دەبێت. هەندێکجار واملێدێت ئەوانیش ناناسمەوە. لێیان دەپرسم «ئێوە کێن؟» ئەوانیش بیرم ناخەنەوە ئەوان کێن و هیچ نالێن، تەنها دەست دەکەن بە گریان. ئێستا زۆر هەوڵدەدەم شتم بیربێتەوە، لە ئێستادا ئەوە تەنها ئەرکی ژیانمە. ناوت لەسەر کاغەزێک دەنوسم، ئەوە زۆر گرنگە، ئەگەر جارێکیتر تۆ لە شوێنێک ببینمەوە و نەتناسمەوە چی دەبێت! پێشتر ژیان و خێزانی خۆمم هەبوو. ئەو کاتە مکیاژم زۆر دەکرد و زۆر جوان بووم، وەک ئێستا لە ژنێکی شێت نەدەچووم، خۆزگە ئەوکاتە بتناسیمایە و وێنەت بگرتمایە، دڵنیام فۆتۆکە زۆر جوانتر دەردەچوو.

لە پشوویەکدا، من و کوڕەکەم و مێردەکەم دەچوینەوە بۆ گوند. شەو بوو، من خەوتبووم، لە ناکاو خەبەرم بووەوە، هەموو دەیانقیژاند. پاسەکەمان لەگەڵ پاسێکیتر دابویان بە یەکدا. ئێمە لەسەر کورسیەکانی پێشەوە دانیشتبووین. بینیم عەزییە شینەکەم بە خوێنی سەری کوڕەکەم سوور بوو. هیچی دیکەم بیر نییە. بیرم نیە کێ ڕزگاری کردم، کێ کوڕەکەم و مێردەکەمی ناشت. هیچم بیر نییە، بەڵام هێشتا هەست بە عەزییەکەم دەکەم سووردەبێت و کاتێک دەستی لێدەدەم، هەست دەکەم دەستم بەر خوێنەکە دەکەوێت.



لەم جیهانەدا کەسم نییە. کاتێک چاو دادەخەم، هیچ کەسێک نابینم. منداڵیم خاڵی و هیچم بیر نایەت. نازانم چۆن و کەی هاتم بۆ ئەم سۆزانیخانەیە. نازانم ئایا خێزانم هەیە یان نا. کاتێک توشی تا دەبم، هیچ کەسێک نییە دەست بخاتە سەر نێوچەوانم. تا ئێستا هیچ کەسێک لێی نەپرسیوم ئایا حاڵم باشە یان نا. هەموو ڕۆژێک دەبێت مکیاژ بکەم، دوو چاوی گەورە دەبینم لە ئاوێنەکەدا. تا ئێستا هیچ کەسێک پێینەگوتوم کە دوو چاوی جوانم هەیە، بەڵام زۆر کەس پێیانگوتوم کە جەستەیەکی جوانم هەیە.

پێویستم بە کەسێکە گرنگیم پێ بدات. پێویستم بە کەسێکە پێمبڵێ چاوەکانم چەند جوانن کاتێک دەگریم. پێویستم بە کەسێکە توند لە ئامێزم بگرێت، کاتێک تام لێدێت. دەمەوێت کەسێک ببینم کە چاوەکانم دادەخەم، بەڵام کەسم نییە و هەرگیزیش کەسم نابێت.

- کچێکی بێ ناو



کە منداڵ بووم، باوکم ئەسپی من بوو، هەمیشە لەسەر پشتی ئەو بووم. هەمیشە شەوان درەنگ لە کار دەگەڕایەوە. بە دەنگی پێی یاخود بە بۆنی ئەو خەبەرم دەبووەوە ڕامدەکرد بۆ لای. زۆری خۆشدەویستین. لە وەرزی باران و تۆفاندا، کاتێک ئاو هەموو شتێکی دادەپۆشی، باوکم منی دەخستە سەر شانی و دەیبردم بۆ قوتابخانە و نەیدەهێشت هیچ ڕۆژێکی قوتابخانەم لەدەست بچێت. باوکم هەمیشە دەیگوت، « ڕۆژێک کچەکەم گەورە دەبێت. ئیتر هەموو کەس دەڵێن ئەمە کچەکەی حسێنە.» خێزانێکی زۆر بەختەوەر بووین. دوای ئەوەی گوێمان لە چیرۆک و نوکتەکانی باوکم دەبوو، بە درێژایی ئەو ڕۆژە دایکم ڕومەتەکانی سوور و دڵی خۆش دەبوو، بەڵام لە ناکاو ڕۆژێک هەموو شتەکان گۆڕان. باوکم نەگەڕایەوە ماڵەوە، دایکم لە پێکەنین کەوت، من چیتر نەمتوانی بچم بۆ قوتابخانە. هەموو دەهاتن بۆ دڵنەوایيکردنمان. چەند ساڵێک تێپەڕی و یادگارییەکانی وەک خۆیان مان. دوای ئەوەی کەوتمە گەڕان و هەموو شوێنێک بەدوایدا گەڕام، ڕۆژێک گەیشتمە بەردەم دەرگای ماڵەکەی باوکم. بینیم باوکم نوکتە و چیرۆک بۆ دایکە تازەکەم دەکات و ئەویش وەک دایکم بۆی پێدەکەنی. بە هێواشی بانگم کرد «باوکە!» کوڕێکی بچوک هاتە بەردەمم و گوتی «باوکت لێرە نییە، ئەمە باوکی منە.» کاتێک لەوێ ڕۆیشتم، باوکم نەیوەستاندم. نەیگوت «کچم بوەستە.»



بەڵام هێشتا کە نوێژ دەکەم دەپاڕێمەوە، «خوایە گیان هەمیشە باوکم بەختەوەر بکە.»

– سۆریفە، ١٥ساڵ

شەش منداڵی دیکەم هەیە بێجگە لە نوری, هەموویان بە هۆی نوری-یەوە ڕقیان لێمە. دایکیان نەخۆش بوو، بۆیە دەبوو خۆم بە تەنها هەموویان بەخێوبکەم. دەمویست چەندە لە توانامدایە، ژیانێکی خۆشیان بۆ دابین بکەم. ئێستا من پیربووم و ئەوانیش گەورەبوون. هەموو خاوەنی ماڵ و منداڵی خۆیانن. هەرگیز چاوەڕوانی هیچم لێنەکردوون، تەنانەت هێشتا دڵخۆشم لەکاتێکدا ئەوان سەرقاڵی ژیانی خۆیانن بێ ئەوەی بیر لە من و دایکیان بکەنەوە. هەمیشە هەموویان کێشەیان لەگەڵ نوری کچە بچووکمدا هەیە. دەیانەوێت بیبەم بۆ هەتیوخانە. دەڵێن کۆمەڵگە شەرمەزاریان دەکات چونکە پیاوێک لە تەمەنی مندا کچێکی بچوک لای خۆی بهێڵێتەوە، بەڵام دڵنیام کردوونەتەوە و پێم گوتون «کۆمەڵگە هەرچ درۆیەک هەڵدەبەستێت با هەڵیبەستێت، من من نزیکی کێڵگەکە، لە زبڵدانێکدا نوریم دۆزییەوە. کەسێک لەوێ فڕێی دابوو، کەس لێی نزیک نەدەبووەوە. روخسەتم لە خاوەنی زەوییەکە وەرگرت و هێنامەوە بۆ ماڵەوە. ژنەکەم زۆر پشتی گرتم. هەرگیز ڕێگە بە کەس نادەم بێت و کچەکەم لێ بسەنێت. ناتوانم ڕێگە بەوە بدەم منداڵێکی بچوک لە ناو زبڵدانێکدا بمرێت. منداڵەکان گومانی ئەوە دەکەن ئەو کچی خۆمبێت، بۆیە هێناومەتەوە ماڵەوە. ئەوان بەلایانەوە گرنگ نییە بۆچی کەسێک منداڵێکی فڕێداوەتە ناو زبڵدانێکەوە، بەڵام هەموو بیر لەوە دەکەنەوە بۆچی من ئەو منداڵە بەخێو دەکەم و خۆشەویستی من بۆ نوری هۆکاری چییە. ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم جیهانە سەیر و سەیرتر دەبێت.



- عبدللە، ٧٠ ساڵ

هەموو پێیان دەگوتم کە هەرگیز ناتوانم بۆ هیچ شوێنێک بچم. خزمەکانم و دراوسێکانم هەموو لێم تورەبوون، چونکە من ئامادە نەبووم واز لە خوێندن بهێنم لە کاتێکدا هەموو خێزانەکەم برسی بوون. لەکاتێکدا دایکم چوو بۆ هاوکاری بگەڕێ تا بتوانێ پارەی خوێندنەکەم دابین بکات، خزمەکانم داوایان لە دایکم کرد بمنێرێت بۆ ماڵێک و بمکات بە خزمەتکار. هەمیشە کە دایکم دەگەڕایەوە، چاوەکانی سوور بووبوون. دایکم و باوکم زۆر دەگرین، بەڵام من هەرگیز ناگریم. بۆ چی دەبێت لەبەرخاتری بۆچونی خەڵکی بگریم. دوای ئەوەی کە تاقیکردنەوەکانی پۆلی نۆ-م تەواوکرد، هەموو دراوسێکانم زۆریان لە دایکم کرد بۆ ئەوەی بمدات بە شوو. لەو کاتەوەی من لەدایک بووم، شتەکان هەر وا بوون. کچان تەنها پێویستە ئەو شتانە بکەن کە پێیان دەوترێت، هەموو مەرج و قسەکانی کۆمەڵگە بە تایبەتی بۆ کچان دروست کراون. لە سێ جیلی پێش خێزانەکەمەوە شتەکان بەو جۆرە هاتوون، هەرگیز کچ نەچووە بۆ قوتابخانە، هەموو لە دوازدە ساڵی دراون بە شوو، بەڵام ویستم مێژوو بگۆڕم. دوای تەواوکردنی قوتابخانە، لە کارگەیەکەوە دەستمکرد بە کارکردن. بەردەوام دەبم لە شەڕکردن بۆ خەونەکانم، چونکە بڕوام بە خۆم هەیە.

- سابینا, ١٨ ساڵ



هیچ ڕۆژێک نەبووە بەبێ خواردنی نانی بەیانی بێمە دەرەوە. هەموو بەیانییەک دایکم برنجی لێدەنا و بە دەستی خۆی خواردنی دەکرد بە دەممەوە. ڕۆژێک ئیتر تەندروستی زۆر زۆر خراپ بوو، چیتر نەیدەتوانی بەیانیان چاوبکاتەوە. ئەو ڕۆژە بۆ یەکەم جار من هەستام و ماڵەکەم پاککردەوە و چێشتم لێنا. خواردنم کرد بە دەمییەوە، وەک چۆن ئەو بە درێژایی هەموو بەیانییەک خواردنی دەکرد بە دەممەوە. دایکم بە سەرسوڕمانەوە پرسی «بۆ ئەو هەموو ئیشەت کرد؟ بۆ نەڕۆیشتیت لە دەرەوە نانی بەیانی بخۆیت؟» منیش بە پێکەنینەوە پێمگوت «چونکە لە ئێستاوە من دایکی تۆم.»

- ئەکرەم، ١٤ ساڵ



یەکەم جار لە شەوێکی زستاندا باپیرمم بینی. لەسەر جادە ساردەکە دەمویست بخەوم، بەڵام لە سەرمادا ددانم شقەشەقەی بوو. هەموو ئەوانیتر گوێنیەکی ئەستوریان پێبوو دابویان بە خۆیاندا، بەڵام من هیچم پێ نەبوو. لە ناکاو پیاوێکی بەتەمەن هات و گوێنیەکەی خۆی دا بە من. لەو ڕۆژەوە لەگەڵ ئەو پیاوە بەتەمەنە دەژیم و بوو بە باپیرم. هەموو جۆرە ئیشێکی دەکرد، سواڵکردن، داگرتنی شتومەک و بەتاڵکرنی گوێنی میوە و پەتاتە، لێخوڕینی عەرەبانە بۆ گواستنەوەی خەڵک و زۆر ئیشی تر. منیش کارم دەکرد و هاوکاریم دەکرد. هەمیشە دەیگوت «بە تەنها هیچ نین، بەڵام پێکەوە پاڵەوانین.» لە سەر جادەوە گواستمانەوە بۆ ژورێکی گەڕەکە هەژارنشینەکان. باپیریشم وەک من بێ باوک و دایک بوو. ڕۆژێک پێیگوتم کە دڵی بە ژنێکەوەیە و دەیەوێت بیکات بە نەنکم. بە تەنها چووم بۆ ماڵی ژنەکە تا بۆ باپیرمی داوا بکەم، بەڵام ئەو دەستیکرد بە قیژەقیژ و دەیگوت «باپیرت لە ورچێکی پیر دەچێت.» وە سوکایەتیەکی زۆریشی بە من کرد. بە درێژایی ئەو ڕۆژە گریام،



بێ ئەوەی بە باپیرم بڵێم ئەو ژنە چی گوتووە.
چەند ساڵێک تێپەڕی و من گەورە بووم. باپیرم توشی ئیفلیجی بوو، دوای ئەوەی گوێنی قورسی هەڵگرتبوو لە کاتی ئیش کردندا فەقەراتی ئازاری گەیشتبوو. بۆ ماوەی پێنج ساڵ چاودێریم کرد. ئەو قسەخۆشترین پیاو بوو بە هەموو ژیانم بینیبێتم. هەموو شەوێک قسەی خۆشی بۆ دەکردم، دەیتوانی نوکتە لەسەر بچوکترین شت دروستبکات و بمخاتە پێکەنین. چەند جارێک ویستی هاوسەرگیری بکەم و چەند کوڕێکی دۆزییەوە بۆم، بەڵام هەموویان ئەو داواکاریەیان هەبوو کە باپیرم جێبهێڵم. منیش هەرگیز بەوە قایل نەدەبووم.
لە کاتێکدا لەسەرە مەرگدا بوو و گیانی دەدا، ئاماژەیەکی بۆ کردم کە نەگریم. لە دواهەمین قسەکانیدا گوتی «هەمیشە پێبکەنە، گەر تۆ پێبکەنیت، منیش لە بەهەشتەوە پێدەکەنم.»

– شارمین

پێشتر ژیانم بەم جۆرەی ئێستا نەبوو. کەسێکی زۆر ڕەشبین و نێگەتیڤ بووم. هەرکات شتێکی خراپ ڕوویبدایە، یەکسەر نەفرەتم لە چارەنوسی ڕەشی خۆم دەکرد و بیرم لەوە دەکردەوە کە من بێ بەختترین کەسی دونیام. نابینا بووم و نەمدەتوانی لایەنە ڕوناکەکەی ژیان ببینم. تەنها سەرنجم لەسەر ئەوە بوو کە خەڵکی هەموو لە من بەختەوەرترن. هەمیشە مامەڵەیەکی خراپم لەگەڵ ژنەکەم و چوار منداڵەکەم دەکرد. پارە بۆ من تاکە هۆکاری بەختەوەری مرۆڤ بوو.
ڕۆژێک خاوەنی یەکێک لە کۆمپانیاکانی دروستکردنی کەشتی هات یەکێک لە کەشتیە تەواوبووکان ببینێ. ماوەیەکی زۆر قسەی بۆ کردین. پیاوێکی ملیۆنێری زۆر غەمبار و بێتاقەت بوو. دەیگوت «ژیانم زۆر ناخۆشە. ژن و منداڵەکانم نرخی ئەو ماندووبوونە نازانن کە من لە پێناو ژیانی ئەواندا دەیدەم. هەرگیز ناتوانم پشوو بدەم کاتێک دەبینم چەند هاوڕێیەکم لە من دەوڵەمەندترن. شەوان خەوم لێناکەویت، ترسی لەدەستدانی سامانەکەم ناهێڵێت بخەوم.» ئەو ڕۆژە کە گەڕامەوە ماڵەوە، هەموو ئەو بیرۆکانەی هەمبوو سەبارەت بەوەی تەنها دەوڵەمەندەکان بەختەوەرن، لەناوچوون. لەو ڕۆژەوە بووم بە پیاوێکی دیکە. گەیشتم بەوەی کە هەبوونی پارە و سامان گرنگ نییە، تەنها بەختەوەری گرنگە. ئێستا نرخی هەر تەکەیەک دەزانم کە بەدەستی دێنم. ئێستا خۆشەویستی خۆم بۆ منداڵەکانم دەردەبڕم و نایشارمەوە، ئەگەرچی نەشتوانم هەموو پێداویستیەکانیان بۆ دابین بکەم. ئەگەر ئێستا شتێکی خراپیش لە ژیانمدا ڕوبدات، بە خۆم دەڵێم «ئارام بگرە، شتەکان لە کۆتاییدا باش دەبن.»

– موبارەک



هەموو شتەکان بە بەرچاومەوە ڕوویاندا. ڕۆحی خۆمان نەبێت، نەمانتوانی هیچی دیکە ڕزگار بکەین. هەموو گەنجینەی ژیانم، عەزی بوکێنیم، یەکەمین یارییەکانی منداڵەکانم، ڕادیۆ خۆشەویستەکەی مێردەکەم، ڕووبارەکە هەموویانی لەگەڵ خۆی برد. ئەو شەوە بیرم لە هیچ شتێک نەدەکردەوە، بیرم لەو قسانە نەدەکردەوە کە دەیانگوت ڕووبارەکە ئەمشەو هەموو ماڵەکانمان یەک یەک هەمووی لەگەڵ خۆی دەبات، من تەنها بۆ کوڕە بچوکەکەم دەگەڕام کە بەبێ ئەوەی کەسمان ئاگادار بکاتەوە چووبووە سەر درەختێک. نەمدەزانی لە کوێیە. وەک شێت بەدەم گەڕانەوە هاوارم دەکرد. بێ ئەوەی کەس بتوانێت بموەستێنێت، چووم بۆ لای ڕووبارەکە. لە کاتێکدا هاوارم دەکرد و دەگەڕام، گوێم لێبوو بانگم دەکات «دایکـــــــە» ئەو شەوە بە دۆزینەوەی کوڕەکەم، هەموو دونیام دۆزییەوە. ئێمە بەهۆی لافاوەکەوە هەموو شتێکمان لەدەست دا، بەڵام هێشتا یەکترمان هەیە و پێکەوەین. ئێستا هەموو ڕۆژێک دێمە ئێرە و دەمەوێت بزانم ڕووبارەکە ماڵەکەمی لە کوێی خۆیدا شاردۆتەوە. تۆ هەرگیز ماڵەکەتت لەدەست داوە؟

– سۆفورە



ئەو ڕۆژەی من لەدایک بووم، دایکم پێی وانەبوو بژی، چونکە برسی بوو و هیچی نەبوو بیخوات. دایکم پێمدەڵێت «تۆ لەو کاتەوە کە لە سکی مندا بوویت، لەگەڵ برسێتی ڕاهاتویت.» ئێستا من و دایکم پێکەوە کار دەکەین. زۆر ماندوو دەبین. هەموو ڕۆژێک لە خۆرهەڵهاتنەوە دێین بۆ کار. هەمیشە کە دەگەڕێمەوە، بە بێتاقەتی و تووڕەییەوە دەگەڕێمەوە. دەبێت ١٠٠ خشت بشکێنم، ئینجا ٩٥ تەکە وەردەگرم، کە زۆر بە زەحمەتیش دەتوانم ئەوە بکەم. من لە خۆر هەڵهاتنەوە تا خۆر ئاوا بوون، نزیکی ٧٠ خشتم پێ ورد دەکرێت، بەڵام دوێنێ ڕۆژێکی ئەفسوناوی بوو. بۆ یەکەمین جار توانیم ١٠٠ خشت ورد بکەم و ٩٥ تەکە وەربگرم. بەو پارە زیادەیە توانیم ئایسکرێم بۆ خۆم و دایکم بکڕم. دوێنێ هەستم کرد کچێکی دەوڵەمەندم ...

- مونجا, ٧ساڵ



هەرچی دەکەم، لە پێناوی خێزانەکەمدایە. لەبەر ئەوە هیچ گلەییەک لە بەختی خۆم ناکەم. دەبێت هەموو شەوێک لەخەو هەستم و بچم بۆ ماسیگرتن. لە ساڵێکدا دوازدە مانگ ئەمە پیشەی منە. هیچ شتێکی خۆش و سەرنجڕاکێش لە ژیانی پیاوێکی ماسیگردا ڕونادات. هەموو شەوێک لە سەرمادا، پەنجەکانم هێندە دەتەزن ناتوانم بیانجوڵێنم، بە ڕۆژیش چاوەکانم سور سور دەبن. هیچ ماسییەک نابەمەوە بۆماڵەوە، بەڵکو دەبێت نیوەی بدەم بە خاوەنی تۆڕەکەم و نیوەکەی دیکەی ببەم بۆ بازاڕ بیفرۆشم. ڕۆژێک ماسییەکی گەورەم گرت و بێ ئەوەی بیبەم بۆ بازاڕ، بردمەوە بۆ ماڵەوە. لە سەر ڕێگەی ماڵەوە، یەکێک لە پاوە دەوڵەمەندەکانی گوندەکەمان، هات



و بەزۆر ماسییەکەی لێسەندم. بەدەم ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەوە لە بێتاقەتی و تورەییدا دەگریام. ئەو دوای نیوەڕۆیە خێزانەکەم هیچیان نەبوو بیخۆن. بۆ ئێوارەکەی درکمان بەوە کرد کە کوڕە حەوت ساڵانەکەمان دیار نەماوە. هەموو شوێنێکی بە دوادا گەڕاین. خواردن و ماسیم هەر بیر نەما. زۆر شتی خراپ بە دڵما هاتن و چوون و بیرم لە هەموو کارەساتە شووم و خراپەکان کردەوە کە دەشێت بەسەر کوڕەکەم هاتبێت. دوای خۆر ئاوا بوون، بینیم کوڕەکەم بە بازێک خۆی هەڵدایە حەوشەی پشتەوە. شوڵێکی گەورەم هەڵگرت و چووم دارکاری بکەم. دواتر بینیم ماسییەکی گەورەی پێیە. ماسییەکەی پیشاندام و هاواری کرد «باوکاااا ئەمەم بۆتۆ گرت.»

– چونو

باوکم دەیویست بە زۆر بمدات بە شوو، بەڵام دایکم ڕێگەی نەدا و بە سەختی ڕووبەڕووی باوکم و ئەو خێزانەش بووەوە کە هاتبوونە داوام. من زۆر بەختەوەرم کە شووم نەکرد و توانیم بچمەوە بۆ قوتابخانە.

- جەنەت ١٢ساڵ



ژیانێکی زۆر باش و بێ کەموکورتیم هەبوو. دوای هاوسەرگیری، وەک هەموو ئەو کچ و کوڕانەی کە تازە هاوسەرگیری دەکەن، ژیانمان خۆش بوو. زۆر دڵم بەو دیارییانە خۆش بوو کە جارجار مێردەکەم، بۆی دەهێنامەوە، وەک تەوقەی قژ و ئاوێنە و ئەو شتانە. هەندێک جار هێندە هەستم بە بەختەوەری دەکرد، لە بەختەوەرییەکەم دەترسام. جوانیان گوتووە کە دەڵێن «ساتە خۆشەکان، زوو تێدەپەڕن.» کەسوکاری مێردەکەم لە خۆشی منداڵەکەی ناو سکم دەیانشۆردم و هەموویان یارمەتییان دەدام و هاوکارمبوون لە هەموو شتێکدا. کابوسەکە ئەوکاتە دەستی پێکرد کە منداڵەکەمم بوو، کچێکی خاوەن پێداویستی تایبەتم هێنایە دونیاوە. هەرگیز ناتوانم لەو کەسانە خۆشبم کە ئازاریان داوم. مێردەکەم هەموو شتێکی لەگەڵ خانەیەکی بێ دایک و باوکاندا ڕێکخست و دەبوایە کچە تازە لەدایک بووەکەم بنێرمە ئەوێ. لە ناکاو خۆشبەختی و یارمەتیدان و خولیا و ئاوات بوون بە چەند شتێکی نامۆ لە ژیانمدا و مێردەکەشم لێم بوو بە مرۆڤی هەسارەیەکیتر.
هەموویانم بەجێهێشت و لەوێ ڕۆیشتم. ئەوە چارەنووسی من بوو چونکە کچەکەمم هەڵبژارد. ئێستا سریتی کچم چواردە ساڵە. ناتوانێت باش بڕوات و قسە بکات. ئەم هەموو ساڵە خۆم ئەرکی خزمەتکردنیم گرتۆتە ئەستۆ. هەرگیر ناتوانیت وێنای ئەوە بکەیت کە ژیان چەندە بە زوویی و لە ماوەی چرکەیەکدا دەتوانێت تەواوی شتەکان پێچەوانە بکاتەوە ...




– لامو

پێم وانییە کارەکەم زۆر سەخت بێت. ڕاستە ئیش لەسەر مەکینەی گەورە گەورە دەکەم و دەبێت هەموو ڕۆژێک دوازدە کاتژمێر ئیش بکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا من مانگی دوو هەزار تەکە وەردەگرم. پێم وانییە هیچ کوڕێکی دە ساڵانی دیکە هەبێت بتوانێت ئەو پارەیە پەیدا بکات. باوکم شۆفێری بەلەمە، ئەوەی لەدەستی هات لە پێناوی ئێمەدا کردی. دوای ئەوەی کە توشی نەخۆشی سیل بوو، هێشتا وازی لە ئیش نەهێنا. ٢٠٠٠ تەکە پارەیەکی زۆرە بۆ من، چونکە هەستی سواڵکردن بۆ خواردن دەزانم چۆنە. ژیانم ئاسان نییە، بەڵام نابێت ئێمە کۆڵ بدەین. ناتوانم خیزانەکەم جێبهێڵم و بە تەنها ئازار بچێژن. من بەختەوەرم کە ئیشیان بۆ دەکەم.

– کەوسەر, ١٠ ساڵ



یەکەم جار کە دەستم کرد بە کارکردن، بووم بە دایەن. دایکم دەیویست بمنێرێت بۆ خێزانێکی دەوڵەمەند و خوێندەوار، تا فێری شتی باش ببم. چووم بووم بە دایەنی فریشتەیەکی تازە لەدایک بوو و کوڕێکی سێ ساڵ و زۆریش بەختەوەر بووم. خاتوونەکەم هەموو پێداویستیەکانی منداڵەکانی لە بانکۆک و سەنگافوراوە دەهێنا. سەرم سوڕمابوو لەوەی منداڵێکی ساوا خاوەنی ئەو هەموو پێداویستییە بێت. هەمیشە خاتوونەکەم دوو کاتژمێری پێدەچوو تا خۆی دەگۆڕی. من شیری قوتوم بۆ منداڵەکە دەکرد و دەمدا پێی بیخوات، چونکە دایکی هەرگیز ئامادە نەبوو شیری خۆی بدات بە کۆرپەکەی. بە بیانوی ئەوەی کە ئەگەر شیری خۆی بدات بە مندڵەکەی، شێوەی جەستەی تێک دەچێت. ڕۆژێک پرسیم کە چەندێک پارە بە کڕینی شتی یاریی خەرج دەکەن بۆ منداڵەکانیان؟ خاتونەکەم بە پێکەنینەوە پێیگوتم کە ئەو ڕقی لە خەڵکی هەژاری وەک دایک و باوکی منە، چونکە هەر منداڵ دەخەنەوە بێ ئەوەی بتوانن پێداویستیەکانیان دابین بکەن. لە ناو ئوتومبیلەکەدا دەبوایە من بە دەستێکم کۆرپەکە و بە دەستەکەی دیکە منداڵەکەی دیکە لە باوەش بگرم،
چونکە خاتوون هەمیشە خەریکی تەلەفۆنکردن بوو، نەیدەتوانی کەسیان بکاتە باوەش. کاتێک کۆرپەکەمان برد بۆ کوتان (ڤاکسین)،ئەو بە تەنها من و منداڵە گریاوەکەی ناردە ژوورەوە و خۆی لە دەرەوە چاوەڕوانی کردم. کە هاتینە دەرەوە، دایکەکە بە ترسەوە بە کۆرپەکەی گوت «ببورە ئازیزەکەم، زۆرم خۆش دەوێیت.» هەموو ڕۆژێک پیی دەگوتم کە خێزانەکەی من بێ کەڵ و بێ ئامانجن و پێویستە پلانیان بۆ منداڵبوون هەبێ. بەڵێ ئێمە هەژارین، بەڵام دایکم هەرگیز شەوان نەیدەهێشت بە تەنها بخەوم. باوکم هەمیشە بە دەستی خۆی نانی دەکرد بە دەممەوە. دایکم شیری خۆی دەکرد بە دەممەوە. چەند ساڵێک بەر لە ئێستا وازم لەو کارە هێنا. باسی هەموو ئەو شتە خراپانەم بۆ دایکم کرد کە لەوێ فێری ببووم. بە دایکمم گوت «بە ئیشکردن لە ماڵی ئەو دەوڵەمەندە، لەوە تێگەیشتم کە خێزانەکەم چەند دەوڵەمەندن».



– ڕابییە

زۆر لەوە زیاتر دەگریم، کە پێدەکەنم. هەمیشە بیردەکەمەوە و لە خۆم دەپرسم، من بۆ هاتم بۆ ئەم دونیا ناشرینە؟ کاتێک لەم وێستگەیەدا منداڵی دیکە دەبینم دڵخۆشن و لەگەڵ دایک و باوکیانن، زۆر زۆر هەست بە غیرە دەکەم. لە زستاناندا لەسەر زەوییە ساردەکان دەخەوم و هەمیشە نەخۆش دەکەوم، کە تاشم لێدێت، هاوار دەکەم و بانگی دایکم دەکەم. بیرم دەچێتەوە کە دایکم داوای لێکردووم کە هەرگیز بە دایە بانگی نەکەم. پێیگوتم دەمرێت ئەگەر پێی بڵێم دایە. دوای کۆچی دوایی باوکم، دایکم هاوسەرگیری کردەوە. لەبەر ئەوەی لەم دونیایەدا لە دایکم زیاترم نەبوو، لەگەڵیان چووم بۆ ماڵە تازەکەیان. هەرگیز بیرم لەوە نەکردبووەوە توشی ئەو هەموو ئەشکەنجەدانە ببمەوە بەدەستی دایکم و باوکە تازەکەم. ڕۆژێک دوای ئەوەی هەردووکیان بە نەعل زۆریان لێدام، لە ماڵەکەش فڕێیاندامە دەرەوە. ئەوکات من تەنها منداڵێکی پێنج ساڵان بووم. دوای کۆمەڵێک خەڵک کەوتم و هاتم بۆ شاری دەکە. لێرە بە گواستنەوەی جانتای خەڵکییەوە خۆم دەژیاند، بەڵام چارەنوسم شتێکی دیکەی بۆ نوسیبووم. ڕۆژێک لە قیتارێک کەوتم و دەستمم لەدەستدا. نازانم من بۆ لە ژیاندام و نەمردووم. نازانم چی لەم ژیانە بێ ئامانجەم بکەم. ئێستا من دەرۆزەکەرم و کەسیش خۆشی ناوێم. بریا بمتوانیبایە کەمێک خۆشەویستیش سواڵ بکەم...

– سەدام، ١٢ ساڵ



پێویستە ڕەزیلی لە هەموو شتێکدا بکەم و پارە کۆبکەمەوە. هەمیشە قەڵەم بەکاردێنم بۆ نوسین. هەر وانەیەک دەخوێنین، ڕاستەوخۆ من لەماڵەوە هەمووی ئەزبەر دەکەم ولەسەر وەرەقەکان دەیکوژێنمەوە و وانەی داهاتوومی تێدا دەنوسمەوە. باوکم پیاوێکی هەژارە، بە عارەبانە خەڵکی دەگوێزێتەوە. ناتوانیک پارەی زۆر کۆبکاتەوە. سێ مانگ بەر لە ئێستا، مامۆستا تایبەتیەکەم داوای لێکردم کە چیتر نەچم بۆ وانەکانی. چونکە سێ مانگ بوو نەمتوانی بوو پارەی وانەکانی بدەمێ. ئەم شتانە تورەم ناکەن. دوای کێشانی زەحمەتێکی زۆر، ئێستا لە وانەکانمدا زۆر باشم. کە گەورەبووم، دەبم بە مامۆستا. بە جۆرێک وانە دەڵێمەوە هیچ قوتابییەک پێویستی بە مامۆستای تایبەتی نەبێت. ئەگەر پارەم هەبێت، ئەیدەم بە یاری منداڵان و لە ناو منداڵە هەژارەکاندا دابەشی دەکەم، چونکە من خۆم هەرگیز هیچم نەبووە یاری پێبکەم. من زۆر گەشبینم بە داهاتووم و بە خەونەکانم. هەرگیز ئاستەنگیەکانی ژیان، نابن بە ڕێگر لەبەردەم ویست و ئارەزووەکانمدا.



- سۆماج. ١٢ ساڵ

من زۆر لە دەرزی دەترسم. جاری پێشوو کە هاتم، ئەوەندە ترسام یەکسەر ڕامکرد و ئێرەم جێهێشت، بەڵام ئەمڕۆ لەگەڵ مێردەکەم هاتووم. بەڵێنی پێ داوم ئەگەر ئەمجارە ئازابم و بتوانم ئەو ڤاکسینە وەربگرم، ئەوا بازنگم بۆ دەکڕێت. من ئەمڕۆ هەموو هەوڵێکی خۆم دەدەم، تەنها لە پێناوی مێردەکەمدا...

– مەکسودە، ٢٧ ساڵ



من هەرگیز نەچومەتە قوتابخانە، بەڵام ژنەکەم تا پۆلی پێنجی خوێندووە. ئێمە لەوەتەی هەین هەژارین. من لە گوند کارم دەکرد و ڕۆژی ١٢٠ تەکەم وەردەگرت. دەبوایە نیوەی داهاتەکەم بدەم بە دایک و باوکم. نازانم ژنەکەم چۆن دەیتوانی بەو پارە کەمەی دەمێنێتەوە خواردن و سەوزە بکڕێت. ئێوارەیەک لە کاتی نانخواردندا، ژنەکەم قاپێکی بچوکی لە تەنیشت قاپەکەی خۆمانەوە دانا. سەرەتا تێنەگەیشتم مەبەستی چییە، بەڵام دوای ئەوەی پێکەنی زانیم کە ئەو دووگیانە. دایک و باوکم بەو هەواڵە دلخۆش نەبوون، چونکە داهاتەکەمان کەم بوو و بەشی نەدەکردین. بۆیە درکم بەوە کرد کە دەبێت هەموو کارەکان بە تەنها بگرمە ئەستۆ. لە دوای کار، دەچووم سەتڵی پڕ لە ئاوم دەگواستەوە وەک کارێکی زیادە تا پارەیەکی زیاتر بەدەست بهێنم. بەو پارەیە دەمتوانی هێلکە و شیر بۆ ژنەکەم بکڕم. لەبەر ئەوەی کە بەرگەی بۆنی هیچ شتێکی نەدەگرت، خۆم دەستم کرد بە چێشتلێنان بۆ خێزانەکەم. هەموو پێیان دەگوتم کە ژنەکەت جادووی لێکردویت، بەڵام من قسەکانیانم پشتگوێ دەخست. چەند مانگێک تێپەڕی و ڕۆژێک دەستی گرتم و داوای لێکردم ماڵەکە جێنەهێڵم. دواتر بەدەم فرمێسک ڕشتنەوە پێیگوتم کە دەیەوێت لە کاتی منداڵبوونەکەیدا لەگەڵی بمێنمەوە. منیش دڵنیامکردەوە کە لەگەڵی دەمێنمەوە. هەموو پێیان دەگوتم کە پێویست ناکات لەگەڵیبیت کاتی کاتی منداڵ بوونەکەی، تەنانەت پێشتر هیچ پیاوێکی خوێنەواریش لە کاتی منداڵبوونی ژنەکەیدا لە ژوری منداڵبوندا لەگەڵی نەماوەتەوە. دەنگی پێکەنین و گاڵتەکردنەکانی ئەوان، لە دەنگی هاواری ئازاری منداڵبوونی ژنەکەم بەرزتر بوو، بەڵام گوێم پێنەدان و دەستیم گرت و لەگەڵی مامەوە. لە کاتێکدا وەک منداڵ دەگریام و فرمێسک بە چاومدا دەهاتە خوارەوە، ژنە ماندووەکەم پێکەنی و پێیگوتم «ئازارەکەی تۆ زۆر لە ئازارەکەی من سەختترە.» دواتر منداڵەکەمان هاتە دونیاوە. پێش ئەوەی مامانەکە کۆرپەکە بکاتە باوەشی ژنەکەم، ژنەکەم داوای لێکرد کۆرپەکە بدات بە من. کۆرپەکەم لە باوەشمدا دەدرەوشایەوە. باوکە هەژارەکەش بە لە ئامێزگرتنی پەرییەکەی زیاتر گریا. ئەمە چیرۆکی منە براکەم، پیاوێکی هەژار و چیرۆکێکی هەژار.



– سوجیۆن علی

کچە بچوکە پێنج ساڵانەکەم لەبرسا کۆچی دوایی کرد. تای لێهاتبوو و داوای ماسی دەکرد. هیج خواردنێکمان نەبوو لە ماڵەوە، نە ماسی نە برنج. لە دوا چرکەکانی ژیانیدا نەمتوانی لە باوەشی بگرم، چونکە چووبوومە دەرەوە سواڵ لەو خەڵکە بکەم کە بێزار بوون هێندە خواردنی بەرماوەیان دابوو پێم. دوای چەند کاتژمێرێک، توانیم هەندێ ماسی و برنجی بەرماوە پەیدابکەم و بە ڕاکردن گەڕامەوە بۆ ماڵەوە. کە گەڕامەوە ماڵەوە، جەستەی سارد و چاوەکانیشی داخرابوون. کچەکەمم لەدەست دا، چونکە گوێم لە قسەی خەڵکی دەگرت. گوێم لە کۆمەڵگا دەگرت کاتێک پەنجەی تۆمەتیان بۆ ژنێک ڕادەکێشا کە دەیویست ببێت بە باوکی خێزانەکەی. مێردەکەم هەر کە چوو بۆ شار، ئیدی ئێمەی لەیاد کرد. خەڵکی پێیان دەوتم دەبێت چاوەڕوانی بکەم، چونکە من ژنم و ئیشی ژن ئەوەیە چاوەڕوانی مێردەکەی بکات، بەڵام مەرگی کچەکەم ژیانی گۆڕیم. من ئێستا سێ منداڵی دیکەم هەیە. ناهێڵم ئەوان بمرن. ئێستا لە حەوشەی ماڵەکەمدا سەوزە بۆ خۆمان بەرهەم دێنم و لە کێڵگەیەکیش کار دەکەم. ئێستا هەموو ڕۆژێک دێم ماسی دەگرم و بۆ منداڵەکانمی دەبەمەوە، بەڵام خۆم چیتر ناتوانم ماسی بخۆم. هەرکات دادەنیشم ماسی بخۆم، گوێم لە چرپەی دەنگی کچەکەمە پێمدەڵێت «دایە ماسیم دەوێ، دایە حەزم لە ماسییە.»

– جوبەیدە خاتوون





من تەنها ئەم عەزییەم
هەیە. دایکیشم وەک
من یەک عەزی هەیە.
شەوان هەردوو عەزییەکە
دەشوات و هەر بە تەڕی
دەیکەینەوە بەرمان. باوکم
بەڵێنی داوینەتێ هەر کات
پارەی دەست بکەوێت،
دەمانبات بۆ بازاڕ و جلمان
بۆ دەکڕێت. من چاوەڕوانی
ئەو ڕۆژەم.

– سادییە، ٥ساڵ

دەزانم بنوسم و بخوێنمەوە. لە زبڵدانەکاندا، هەموو جۆرە کتێبێکم دۆزیوەتەوە، بەڵام نامەوێت بچم بۆ قوتابخانە. چونکە هەموو ڕقیان لێمە و پێمدەڵێن کە من بۆنم زۆر ناخۆشە و بۆنی پێستەم لێدێت. من لە کارگەیەکی پێستە کار دەکەم. من ناتوانم هەموو ڕۆژێک خۆم بشۆم. لە گەڕەکە هەژار نشینەکەی ئێمە، خەڵکی دەبێت بە سەتڵ لە دەرەوە ئاو بهێنن. ئەو ئاوەی منیش دەیهێنم، بۆ خواردن دروستکردن بەکاری دێنین. من تەنها دوو پانتۆڵم هەیە. ژیانم ئاسان نییە.

- بیلال، ١٠ساڵ



کاتێک دایکم کۆچی دوایی کرد، من پێنج ساڵ بووم. هەموو دەڵێن کە من زۆر لەو دەچم. باوکم هیچ وێنەیەکی ئەوی نەبوو، بۆیە نەمدەزانی ڕوخساری دایکم چۆن بووە. هەرکات باوکم دەیگوت کە من لە دایکم دەچم، زڕدایکەکەم زیاتر و زیاتر ڕقی لێم دەبوو. کاتێک پازدە ساڵ بووم، بە زۆر دایانم بە شوو بە پیاوێکی پەنجا ساڵ. زۆر لەو پیاوە و سێ ژنەکەی دیکەی دەترسام. بە درێژایی پازدە ساڵی تەواو منیان ئەشکەنجە دا. ڕۆژێک لە ناکاو بوێری ئەوەم کرد و لەو دۆزەخە هەڵهاتم. بەو راستییە گەیشتم کە هەرگیز نابم بە دایک، وە هیچ حەزێکیشم بە دووبارە هاوسەرگیری کردنەوە نەبوو. بۆیە دوو کچم هەڵگرتەوە کە لەسەر جادە لەگەڵ خۆم دەژیان. ناوم نان نیشا و ڕاشا. ئێستا خاوەنی خێزانێکی بەختەوەر و دڵخۆشم. کچەکانم هەموو شتێکی ژیانمن. دەتوانم لە پێناو ئەواندا بەرەنگاری هەموو ئاستەنگییەکانی ژیان ببمەوە.

– ئاشە، ٤٥ ساڵ



زۆر شەو بە برسێتی دەچومە ناو جێگەوە، چونکە دایکم هەموو داهاتەکەی لە کڕینی ماددەی هۆشبەردا خەرج دەکرد. دایک و باوکم هەردووکیان مادەی هۆشبەریان بەکار دەهێنا، بۆیە لە هەشتساڵیدا ماڵەوەم جێهێشت و هاتم بۆ ئێرە. لە منداڵییەکی زووەوە دەستم کرد بە کار تا لەم جیهانە گەورەیەدا بتوانم بمێنمەوە. لەسەر شەقامەکان دەژیام و لەگەڵ نەنکم دەمامەوە. نەنکی ڕاستەقینەم نییە، تەنها لەسەر ئەم شەقامە پێکەوە دەژین و شەوان لە یەک شوێن دەخەوین. ئەو ناردمی بۆ قوتابخانە. زۆر بەختەوەرم لێرە، چونکە لەگەڵ کەسانێکم خۆشیان دەوێم و ڕێزم لێدەگرن و قەدرم دەزانن. کاتێک پشانی نەنکمی دەدەم لە ١٠٠، ١٠٠م هێناوە لە تاقیکردنەوەدا، ئەو لە هیچ تێناگات، بەڵام بە فرمێسکەکانیدا دەزانم کە دەتوانم خەونەکانی خۆم و ئەویش بەدیبهێنم...



– بۆنا، ١٢ساڵ

شەوان لە تاو ئازاری ملم ناتوانم بخەوم. بۆ بەدەست هێنانی ١٠٠ تەکە، دەبێت ڕۆژی ١٠٠٠ خشتی ٢،٥ کیلۆیی بگوازمەوە. تەنانەت بە شەویش ناتوانم پشوو بدەم. ئێستاش لەرز و تام هەیە، بەڵام لە پێناوی خۆم و مونیادا دەبێت کار بکەم. کاتێک کوڕەکەم یەک ساڵ بوو، مێردەکەم ژنی دووهەمی هێنا، مونیا ژنی دوهەمی مێردەکەم بوو. تۆ لەو هەستە تێناگەیت ئەگەر مێردەکەت ببینی لە هەمان ژوردا لەگەڵ ژنێکی دیکەدا بژی. زۆرم ڕق لێی بوو. دە ساڵ بەر لە ئێستا، لە ڕوداوێکی هاتوچۆدا مێردەکەم گیانی لەدەست دا و مونیاش هەردوو قاچی لەدەست دا. لەو ساتەوە من چاودێری دەکەم و بەخێوی دەکەم. هەرچی پارە پەیدا دەکەم، لە خۆم و ئەودا خەرجی دەکەم. هەموو پێمدەڵێن کە مونیا دەربکەم، بەڵام من ناتوانم. دڵنیام ئەویش وەک من هیچ شوێنێکی نیە بۆی بچێت. کوڕەکەشم هەرگیز نایەت بۆ سەردانم. زۆر باش دەزانم هەستی جێهێشتن چ ئازارێکی هەیە...



ژیانم پڕە لە دڵخۆشی. ئەگەر پێتوایە هەژاری کردومی بە ژنێکی بێتاقەت و بێزار، ئەوا با پێت بڵێم کە تۆ زۆر هەڵەیت. هەرچەندە مێردەکەم بە بێ ئەوەی هیچ بڵێت و ماڵاواییم لێبکات و هیچ ئاسەوارێک جێبهێڵێت لەگەڵ ژنێکی دیکە هەڵهات، بەڵام توانیم هێزی خۆم بەدەست بهێنمەوە و بیر لە ڕابردوو نەکەمەوە. توانیم ئەرکی بەخێوکردن و پەروەردەکردنی هەر سێ مندڵەکەم لە ئەستۆ بگرم. هەر لە سەرەتاوە پێمگوتن کە من هەم دایکیانم و هەم باوکیان. لەو ڕۆژەشەوە لە هۆکاری ڕۆشتنی باوکیان نەپرسیوە. هەر سێ منداڵەکەم ناردووە بۆ قوتابخانە و خۆشم بە تەنها کاریان بۆ دەکەم. هەموو مانگێکیش دەیانبەم بۆ گەڕان و ئایسکرێمیش دەخۆین. خۆشترین ساتەکانی ژیانم، ئەو ساتانەن کە شەوان لە دەورم کۆدەبنەوە و داوام لێدەکەن باسی خەونەکانی خۆمیان بۆ بکەم لە بارەی ئەوانەوە.

– دولێنا ٣٠ ساڵە و ڕۆژی ١٠٠ تەکە پەیدا دەکات



هەمیشە منداڵەکانم لێمدەپرسن کە بۆ هێندە ماڵ دەگوێزینەوە لە دورگەیەکەوە بۆ دورگەیەکیتر. من هیچ وەڵامێکم پێ نییە بۆیان و منیش هەموو ڕۆژێک هەمان پرسیار لە خودا دەکەم. تا ئێستا شەش جار ڕوبار خانووەکەمانی بردووە. شەش ڕۆژ بەر لە ئێستا هاتین بۆ ئەم دورگەیە و حەوتەمین خانومان دروست کرد. ئەم خانووەمان بێ سەقفە و ئازارەکانی ناوی بێکۆتایین. لەم دورگە دوورەدەستەدا، مێردەکەم تەنها دەتوانێت کاری ماسیگری بکات. دوێنێ شەو هەر پێنج منداڵەکەم برسییان بوو و لە سەرماشدا هەڵدەلەرزین. لە سەرمادا، هەموو پاڵمان دابوو بە یەکەوە و باوکیشیان بە دەنگی بەرز قورئانی دەخوێندەوە. ئێمە خەمی داهاتومانە و شەڕیش لەگەڵ ئەمڕۆدا دەکەین. هەر ڕۆژێک مێردەکەم بتوانێت ماسییەک بگرێت، ئەو ڕۆژە دەتوانین نان بخۆین و برسیمان نەبێت...

– خەدیجە، ٤٠ ساڵ



ئێمە کەسمان نییە. ئێمە ماڵێکمان نیە بۆی بچین. ئێمە هیچ کەسێکمان نییە قسەی لەگەڵ بکەین. ئێمە تەواو تەنهاین. لە سێ مانگی ڕابردوودا، لە پازدە وێستگەی جیاوازی شەمەدەفەردا خەوتووین. دوای مەرگی دایکمان، باوکمان ژنی هێنایەوە. خۆی و دایکە تازەکەمان، شەو و ڕۆژ ئەشکەنجەیان دەداین. جارێکیان دایکە تازەکەمان، ڕۆنی قرچاوی ڕشت بە گیانی ئۆیل دا. زۆرشەو لە ترسدا خەومان لێنەدەکەوت. هەندێک ڕۆژ دەچووین بۆ سەر گۆڕەکەی دایکمان و بە بێدەنگی چەندین کاتژمێر دەگریاین. سێ مانگ بەر لە ئێستا، باوکم لە ماڵ دەری کردین. ئێمە ڕومانکردە دەرودراوسێ، بەڵام کەسیان دەرگەیان لێنەکردینەوە. بۆیە سواری شەمەندەفەرێک بووین و هاتین بۆ شار. بە کۆکردنەوەی بتڵی پلاستیکی ئاو و حەماڵی کردن خۆمان دەژێنین. هەندێک شەو لە کاتی خەودا پارەکانمان دەدزرێن. شەوان کاتێک ئۆیل لە برساندا دەگری، هەمیشە حیکایەتی بۆ دەکەم. پییدەڵێم کە ڕۆژێک دایکم وەک فریشتە دەگەڕێتەوە و لەگەڵ خۆیدا خواردن و شیرینی و جل و پیڵاومان بۆ دەهێنێت. ئۆیل زۆر دڵپاکە. بڕوای بە قسەکانم کردووە و پێیوایە بەم نزیکانە دایکم دێتەوە.



– علی نور، ١٠ ساڵ.  ئۆیل نور، ٧ ساڵ

باشترین شتی ژیانم، ئەم کوپە چایەیە. من قوم لەو چایە دەدەم کە لە ٪ ١٠٠ لە  پارەی حەڵاڵ کڕدراوە. چ دەوڵەمەندێک هەیە بتوانێت وەک من بە دڵنیاییەوە بڵێ ئەو جلەی لەبەریاندایە، ئەو نانەی دەیخۆن، هەموو ئەو شتانەی هەیانە، لە پارەیەکی حەڵاڵەوە بوونە بە خاوەنی؟ ڕاستگۆیی و حەڵاڵی کارەکانم، هێزی ژیان و بەختەوەریمن.

– حەسینە، ٣٨ساڵ





ئەگەر ڕاستیەکت پێبڵێم لێمنادەیت؟ لە ڕاستیدا من پەتاتە دزم. دایکم تایەکی زۆر خراپی لێهاتووە و ناتوانێت کار بکات. باوکم کە ژنی دووەمی هێنا و ئێمەی دەرکرد. باوکم هەموو جارێک هێندەی لە دایکم دەدا، لە جوڵەی دەخست. پێنج ڕۆژ بەر لە ئێستا من و دایکم هەرچۆنێک بووە لەسەر شەمەندەفەرێک شوێنی خۆمانمان کردەوە و هاتین بۆ دەکە. لەسەر ڕێگە و شەقامەکان دەخەوین. لە بەیانییەوە تا دوای نیوەڕۆ، من هەوڵی دزینی پەتاتە دەدەم. ئەگەر بتوانم هەندێک پەتاتە یان سەوزە بدزم، ئەوا دەچم دەیانفرۆشم و بە پارەکەی خواردن دەکڕم. لە دوای نیوەڕۆی دوێنێوە تا ئێوارەی ئەمڕۆ ئێمە نانمان نەخواردووە. تا ئێستاش هیچم دەست نەکەوتووە بیدزم، زۆرم برسییە..

– مۆفیزول، ٧ ساڵ

هەموو ڕۆژێک لەبەردەمماڵیاندا یاری کراکێتم دەکرد. دڵنیاش بووم کە هەرگیز تەماشام ناکات. هەموو ڕۆژێک تا قوتابخانە دوای دەکەوتم و دڵنیاش بووم کە تەنانەت هەستیشم پێناکات. جوانتریش شتی کە من زۆرم خۆشدەویست، پێکەنینەکەی بوو. هەشت ساڵ بە بێدەنگی خۆشمویست، بێ ئەوەی یەک وشەش بگۆڕینەوە. ئاهـ ببوورە لەبیرمچوو ئەوەت پێبڵێم کە ئێمە هەردووکمان لە یەک تەمەندا بووین و هەردووکیشمان هەژار بووین. ئەو بێ باوک بوو و لەگەڵ پوری و مامیدا دەژیا. ڕۆژێک پێش ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەی لەگەڵ پیاوێکی دەوڵەمەندا، هات بۆ لام بۆ ماڵەوە. ئەوە یەکەم جارمبوو کە قسەی لەگەڵ بکەم. هیوای ژیانێکی بەختەوەرم بۆ خواست. بە گریانەوە جێیهێشتم. دوای هاوسەرگیرییەکەی، بە نهێنی دەچووم بۆ ئەو کۆڵانەی کە لێی دەژیا. خانووەکەیان هێندە گەورەبوو، لە کۆشک دەچوو. بەخۆمم دەگوت «ئێستا دەبێت ئەو چ ژیانێکی بەختەوەرانە بژی!»، دوای چەند ساڵێک دەمبینی ئێواران دێتە باڵکۆنییەکە و زۆر بێتاقەت و غەمبار و نەخۆش دەردەکەوت.
دوای دە ساڵ لە هاوسەرگیرییەکی نابەختەوەرانە، خەڵکی دەڵێن ئەو بە شێرپەنجەی سی یان مێشک یان جگەر لە ٣٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، بەڵام من دەزانم ئەو لە نەبوونی خۆشەویستیدا مرد. تەنها خەتاباریش منم چونکە ئەوکاتانەی پێویستی بە من بوو، من لەوێ نەبووم تا لە ئامێزی بگرم ...

– ڕەجیبی ئەویندار،
٣٢ ساڵ



دەمێکە دایکم کۆچی دوایی کردووە، تەنانەت ڕوخساریشیم نایەتەوە یاد. ساڵی پار باوکیشم ڕۆیشت و جێی هێشتین. لە دوای ڕۆیشتنی باوکم، چیتر زڕدایکەکەم ئامادە نەبوو خواردنم بداتێ.من بەرگەی برسێتی ناگرم. بیستم کە خەڵکی دەکە گوزەرانیان باشە و نانی باش دەخۆن. بۆیە سواری شەمەندەفەرێک بووم و هاتم بۆ ئێرە. لەم وێستگەیە لەگەڵ براکانمدا دەخەوم. برای خوێنیم نین، بەڵام لە برای خوێن باشترن بۆم. یەکەم شەو کە هاتم بۆ ئێرە، پیاوێکی چاکەت ڕەش بەدوامەوە بوو. خەڵکانێکی زۆرم لە دەور بوو، بەڵام کەس نەهات یارمەتیم بدات. ئیدی لە ناکاو هەموو براکانم بە خۆیان و سەگەکانیانەوە هاتن و منیان لەو درندەیە ڕزگار کرد. لەو ڕۆژەوە ئەوان دەمپارێزن.

– تۆنی، ١٢ ساڵ



هەموو پێمدەڵێن ئەو پارەیەی پەیدای دەکەم زۆر کەمە و بەشی هیچ ناکات. منیش هەمیشە پێیان دەڵێم «من بۆ پارە کار ناکەم، من بۆ ئاسودەیی کار دەکەم.» من مامۆستای سەد و بیست قوتابیم. لە گوندەکەی ئێمە من تەنها مامۆستای کچم. کچانی گوندەکەم یاخود هاوسەرگیرییان کردووە، یاخود لە پەیوەندیدان و بە پەیوەندییەکەیانەوە سەرقاڵن. ماوەیەک بەر لە ئێستا کوڕێک هاتە خوازبێنیم و داوای لێکردم واز لە کارەکەم بێنم. منیش داوای لێبوردنم لێکرد و قایل نەبووم. لە ژیانمدا زۆر شتی لە هاوسەرگیری و پەیوەندی گرنگتر هەیە ئەنجامیان بدەم ها ها ها ...

– نۆیۆن مۆنی، ١٨ساڵ





ئێستا منداڵەکانم گەورەن و لەگەڵ ماڵ و منداڵی خۆیاندا خەریکی ژیانی خۆیانن. کورەکانم بچووک بوون کە دایکیان کۆچی دوایی کرد. هێندە بە بەخێوکردن و گەورەکردنیانەوە سەرقاڵ بووم، هیچ کاتم نەبوو بیر لە ژیانی خۆم بکەمەوە، بەڵام ئەوەتا ئێستا لە هیچ شوێنێک جێگام نابێتەوە. لە دەرەوە لە حەوشەکەدا ماڵیکیان بۆ دروستکردووم بۆ ئەوەی دوربم و نەمبینن. کوڕەکانم هەمیشە پێمدەڵێن کە ژنەکانیان بێزار نەکەم، لە کاتێکدا من زۆر بە کەمی قسەیان بۆ دەکەم و ئەوانیش زۆر بە دەگمەن گوێم لێ دەگرن. شەش مانگ بەر لە ئیستا هەموویانم جێهێشت. ئێستا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە گەشت دەکەم و بە جۆرێکی دیکە بە ناو ژیاندا دەگەڕێم. دوای ئەم گەشتکردنە بەوە گەیشتم کە من لە ناو خیزانەکەی خۆمدا بێگانە بووم، بەڵام لە ناو خەڵکی نەناسدا ئاشناترم و زۆر ئاسودەترم.

– مۆنو

من و ژنەکەم خوێن و ئارەقمان ڕشت تا ئەم خانووەمان دروست کرد. خەونمان بەوەوە دەبینی خانویەک دروست بکەین و دواهەمین ساڵەکانی ژیانمانی تێدا بەسەر ببەین. وەک خەونمان پێوە بینیبوو، منداڵەکانمان لەو خانووەدا گەورە بوون. دوای چەندین ساڵ، ڕۆژێک ڕوباری جامونە وەک کابوسێک هات و خانووەکەمانی لەگەڵ خۆیدا برد. هەرگیز پێمان وا نەبوو ڕوبارەکە بتوانێت هێندە نزیک ببێتەوە. ئێستا تەنها بیرەوەریم هەیە و هیچ سوێنێکم نییە تێیدا بژیم. ژیان پڕە لە ڕوداوی سەرسورهێنەر و چاوەڕواننەکراو.

– شەها عەلی, ٦٠ ساڵ



زۆر سوپاسی خودا دەکەم.ماڵم هەیە تێیدا بخەوم، خواردنم هەیە بیخۆم، منداڵم هەیە خۆشم بوێت. زۆر کەس هەن نزیکی ئەم وێستگەی شەمەندەفەرە دەژین و شەوان بە هۆی سەرماوە دەناڵێنن و بە ڕۆژیش سواڵ دەکەن بۆ خواردن و هیچ کەسێکیان نییە چاودێرییان بکات. کاتێک ئەوان دەبینم، واز لە گلەییکردن دێنم لە خودا سەبارەت بەو کێشە بچوکانەی کە هەمن. من لەم خانووە بچوکەدا دەژیم و نیوەڕوان و ئێواران برنج دەخۆم. هەرچەندە نەخۆشیشم، بەڵام سوپاسی خودا دەکەم بۆ ئەو هەموو ڕەحمەتەی بە منی بەخشیوە. من هیچ کێشەیەکی گەورەم نییە بۆ تۆی باس بکەم. من سوپاسگوزارم بۆ هەموو ئەو شتانەی لە ژیانمدا هەمن.

– مورشیدە، ٥٥ ساڵ. لەبەردەم ماڵەکەیدا



پێمدەڵێن کە خودا لە ئاگری دۆزەخدا دەمسوتێنێت. من قاقا بەو قسەیەیان پێدەکەنم. بەڵێ، من چەندین ساڵ لە ئاگری دۆزەخدا سوتام. ئەو کاتانەی مێردەکەم و هاوڕێکانی زۆر شەو لاقەیان دەکردم. ئەو کاتەی لەقەی لە سکم ئەدا تا کۆرپەکەمی کوشت. پێمدەڵێن خودا لە دۆزەخدا هەڵم دەواسێت. من بروام بە خوای خۆم و بە بەزەییەکانی هەیە. هیچ کەسی تر ناتوانێت پێمبڵێت من دۆزەخیم یان نا، بێجگە لە ئەو.

– لەشفرۆشێک





خێزانەکەمان پێنج کەسن و تەنها من کار دەکەم. ڕۆژانێکمان بەڕێکرد کە لەماڵەوە نانمان نەبوو بیخۆین، بەڵام ئێستا دەتوانم دوو خوشکە بچوکەکەم بنێرم بۆ قوتابخانە. خەڵکی پێمان دەڵێن هەژار. بەڵێ، ئێمە هەژارین. ڕۆژانی باران، من تا بەیانی بەخەبەر دەبم و خێرا خێرا سەتڵ دەخەمە بەر باراناوی بنمیچی خانووە تەنەکەکەمانەوە. ئێمە هیچمان نییە، نە پارە، نە هیچ هۆکارێکی ژیان. تەنها خاوەنی خۆشەویستین لە دڵماندا بۆ یەکتری. ئەو خۆشەویستییە نەبێت، هیچیتر شک نابەین.

– ڕینا

من دەترسم، دەترسم ئەوکاتەی دەمرم دەورم چۆڵ بێت. نا، نەخێر من لە مردن ناترسم، بەڵام لەو جۆرە مردنە دەترسم کە کاتی گیان دەرچون کەسم لەلا نەبێت. کەس نەبێت قسەم لەگەڵ بکات و ماڵئاواییم لێ بکات.

– دایکێک لە خانویەکی کۆندا



چاوەکانم دادەخەم تا هەست بە هاژەی مۆسیقاکە بکەم کە بە ناومدا دێت و دەڕوات و ڕۆحم لە هەموو ئازار و گوناهەکان پاک بکاتەوە و بیرم بخاتەوە کە من زۆر لەوە بەهێزتر و باشترم کە بڕوام پێیەتی.

– خاتونێک لە تاترۆخانەیەکدا





ژنەکەم زۆر حەزی لە سینەما بوو. لە سەرەتای هاوسەرگیریمانەوە، ژنەکەم داوایلێدەکردم بچین بۆ سینەما. بەڵام لەبەر ئەوەیماڵی باپیرانم ئیسلامییەکی کۆنسێرڤاتیڤ بوون. هەرگیز نەمدەتوانی وێنای خۆم بکەم کە لەگەڵ ئافرەتێکدام و دەچم بۆ سینەما. سێ ساڵ بەر لە ئێستا، کاتێک پزیشکەکە پێی گوتم کە ڕەنگە ژنەکەم زۆر نەژی، بیرکردنەوەکانمم گۆڕی و ڕۆژێکی تەواومان پێکەوە لە سینەما بەسەر برد، دوای ٥٠ ساڵ لە هاوسەرگیرییەکەمان، چووین بۆ سینەما و بۆ ڕێستۆرانتێکی خۆش و ڕاقی. ئەوە تەنها ڕۆژە لە ژیانمدا تا دەمرم یادی دەکەمەوە و ڕێزی لێ دەگرم. بەداخەوە ئەو چیتر لێرە نییە.

– شەهاددودین، ٧٥ ساڵ



ماوەیەکی کەمە فێری مەلەکردن بووم. بە منداڵی زۆر لە ئاو دەترسام، بەڵام دایکم فێری مەلەی کردم. هەمیشە پێمدەڵێت کە کچان دەبێت هەموو شت بزانن، مەلە، نوسین و خوێندنەوە، چێشتلێنان، هەموو شت.

– ئەسمانی



دە ساڵ بەر لە ئێستا ژنەکەم کۆچی دوایی کرد. چوار منداڵم هەیە. بەڵام ئیستا بەتەنهام و کەسم لەگەڵ نییە.

– هاری پراشاد

(کاتێک پرسیاری زیاترم لێکرد لە بارەی منداڵەکانیەوە، چاوەکانی پڕ لە فرمێسک بوون و هیچی پێ نەوترا).

دەمەوێت ببم بە کوڕی باوکم.

– مۆنی، قوتابی پۆلی پێنجەم



(مامۆستاکەی مۆنی بۆی ڕونکردمەوە کە هەمیشە باوکی لە دایکی تورە دەبێت چونکە کوڕیان‌نابێت.بۆیەمامۆستاکەی ئامۆژگاری مۆنی کردووە کە ئەگەر باش وانەکانی بخوێنێت ئەوا لە داهاتودا دەتوانێت بەرپرسیارێتی خێزانەکەی بگرێتە دەست وەک کوڕ).

ده مانگ بەر لە ئێستا هاوسەرگیریمان کرد. ئەو دوور لە ئێرە، لە دەکا کار دەکات. لە دوای هاوسەرگیرییەکەوە، بە درێژایی ئەو هەموو مانگە یەکمان نەبینیوە. لەبەر ئەوەی کە مانگانەکەی زۆر کەمە، ناتوانێت لەگەڵ خۆی بمبات بۆ دەکا. زۆر بیری یەکتری دەکەین. مۆبایلیشم نییە و ناتوانم پەیوەندی پێوە بکەم. تەنها لە ڕێگەی مۆبایلەکەی خەزورمەوە قسە دەکەین. کاتێکیش پێکەوە قسە دەکەین، هەموو لێم نزیک دەکەونەوە و گوێمان لێدەگرن. لەبەر ئەوە تەنها هەواڵی تەندروستی لێدەپرسم. دوێنێ داوای لێکردم وێنەیەکی خۆمی بۆ بگرم. بەم نزیکانە دێتەوە و لە گەڕانەوەدا فۆتۆکە لەگەڵ خۆی دەبات. ئەمە عەزی ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەمانە بۆ فۆتۆکە لەبەرم کردووە. چونکە دەمەوێت یادی پێکەوەبونمان بکاتەوە.

مونیره



دایکم سواڵکەر بوو، مانگی جارێک سەردانی دەکردم. من لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەژیام کە هەڵیان گرتبوومەوە، نەمدەزانی سواڵکەرەکە دایکی ڕاستەقینەمە. ئەو کاتانەی سەردانی دەکردم هەندێ کات چەند قتویەکی بچوکی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا کە یاری منداڵانەی شکاو و خواردنی بەرماوە و جل و بەرگی نەگونجاو و بازنەی شوشەیی جۆراوجۆری لەناودا بوون. هەرگیز دەستم لێنەدەدان. و دەمگوت ئەم شتانە چەنێک پیسن، بێ هەست کردن بەوەی کە چەنێک کات و توانای خۆی بەکارهێناوە لە دەستکەوتنیان. دایکم ڕقی لە ئەو بوو، ڕۆژێک هەڕەشەی لێکرد کە جارێکی دیکە نەیەتەوە، منیشی ئاگادار کردەوە کە ئەو ژنە جادووگەرە و جادوو لە منداڵان دەکات. منیش باوەڕم پێکرد، لەو ڕۆژەوە ڕقم لە دایکی ڕاستەقینەم هەڵگرت. بە لای منەوە ئەو هەرگیز وەکو جادووگەرێک نەبوو بەڵام دایکم دەیگوت کە ئەو یەکێکە لە هەرە خراپترین جادووگەرەکان.
کاتێک ١٣ ساڵان بووم، سواڵکەرەکە وەستا لە سەردان کردنم بەڵام من هەموو ڕۆژێک چاوەڕێم دەکرد، چەند ساڵێک تێپەڕی، هەتا ڕۆژێک دایک و باوکم دانیان بەوەدانا کە منیان لە سواڵکەرەکە کڕیوەتەوە لە بەرامبەر بازنەیەکی ئاڵتوندا. لەو کاتەدا نەمدەزانی ڕقم لە کامیان بێت، دایکە ڕاستەقینەکەم یان ئەو کەسانەی کە بە درێژای ئەو هەموو کاتە درۆیان لەگەڵ کردبووم. دایک و باوکم ئەو بازنە ئاڵتونەیان دەرهێنا و دایانە دەستم. لە رابردوودا دایکە سواڵکەرەکەم ئەو بازنەیەی کە ڕۆژێک لە بەرامبەر پێدانی مندا وەریگرتبوو، دووبارە بەخشیبووی بە خۆم. دایکم دەترسا من لەدەست بدات هەر لەبەر ئەمەش ڕێگەی بە دایکە سواڵکەرەکەم نەدا بوو بۆ دوایین جار لەگەڵمدا قسە بکات. لە کۆتاییدا ئەوەشیان ئاشکرا کرد کە سواڵکەرەکە کۆچی دوایی کردووە.
تێناگەم دایکم ویستوێتی چیم پێبڵێ، بۆچی بەجێیهێشتووم و لە کوێوە هاتووم؟ بەڵام من بازنەکەم هەبوو کە بەڵگە بوو بۆ ئەوەی لە بەرامبەر پارەدا منی نەفرۆشتووە. ساڵی پار،دایکێک کە بە تەنیا لەگەڵ کچەکەیدا دەژیا، ژوورێکی تەنیشت ئەوەی ئێمەی بە کرێ گرت، زۆرینەی کات بە ئیرەییەوە سەیرم دەکردن، پێکەوە هەوڵیان دەدا، یەکتریان خۆشدەویست، پێدەکەنین، دەگریان بەڵام هەرگیز یەکتریان بە تەنیا جێنەدەهێشت. ڕۆژێک دایکەکە نەخۆش کەوت و بردمانە نەخۆشخانە، کاتێک پزیشکەکە پێی گوتین گەر نەشتەرگەری بۆ نەکەین ڕزگاری نابێت، سەیری کچە ١٠ ساڵانەکەم کرد و خۆمم تێدا بینیەوە. ئەو ڕۆژە بازنەکەمم فرۆشت و پارەکەیم دایە کچەکە. هەموو ئەوەی دەمویست ڕزگارکردنی دایکێک بوو، کە من نەمتوانی بوو بۆ خۆمی بکەم.

– ڕاهێلا



لە منداڵیدا دەمبیست کە غیرەکردن چەندە خراپە. هەوڵی زۆرم دا تا غیرە لەکەس نەکەم، بەڵام نەمتوانی. غیرە لە هەر دراوسێیەک دەکەم کە بۆنی مریشکەکەیان دێت کە لێی دەنێن. غیرە لە هەر ژنێک دەکەم کە لە تەمەنی خۆمدایە و قژی ڕەنگێکی جیاواز کردووە. غیرە لە هەر کەسێک دەکەم کە پێدەکەنێت.

– جۆرنا. ٢٥ ساڵ. لە کوخێکی بچوکدا دەژی لە تەنیشت هێڵی شەمەندەفەرێک





باشە ئەگەر لەم شارەدا هیچ منداڵێکی تێدا نەبێت دەبە و شوشە و پلاستیک کۆبکاتەوە، ئەم شارە چی لێ دێت؟ هاهاها دەبێت بە زبڵدان. ئیشەکەم ئەوەندەش قورس نییە. بە هەموو شوێنێکدا دەگەڕێم و خەڵکی لە دوورەوە دەبینم. تەنانەت جارێکیان مۆبایلێکی شکاوم لە زبڵدانێکدا دۆزییەوە. هەمیشە بۆ هەموو شوێنێک پێم بوو. بەو مۆبایلەوە، خۆم وەک پیاوێکی دەوڵەمەند دەبینی، بەڵام هیچ کەسم نەبوو تەلەفۆنی بۆ بکەم.

– شاودین، ١١ساڵ

تۆ ناتوانیت هیچ شتێکی ڕابردوم بۆ بگێڕیتەوە. پێمبڵێ چی لە چیرۆکی ژیانم دەکەیت؟ دەتوانیت ژیانمم بۆ بگێڕیتەوە؟ من کچ و کوڕێکم هەبوو. دوای کۆچی دوایی باوکیان، ماڵی خەزورم بە زۆر خانوەکەیان لێسەندین. من و دوو منداڵەکەشم لە ناو تەویلەکەدا دەخەوتین لەگەڵ مانگاکاندا. من و کوڕەکەم شەو و ڕۆژ کارمان دەکرد. کاتێک کچەکەم بوو بە سیازدە سال، هەستم دەکرد هەندێ پیاو دەیانەوێت لێی نزیک ببنەوە و لە کێڵگەکەدا دەستدرێژی بکەنە سەر. بۆیە ناچار زوو دامان بە شوو. دوای ساڵێک دوو گیان بوو. دواتر نازانم چی ڕویدا، کاتی منداڵبونەکەی منداڵەکەی لە بار چوو، ئیدی باری دەرونی تێکچوو و شێت بوو. مێردەکەی لە ماڵەکە دەری کرد. کوڕەکەم هەندی پارەی کۆکردەوە و هەرچۆنێک بوو خوشکەکەی برد بۆ نەخۆشخانەی پابنای دەرونی. نە خۆشخانەی پابنا ١٠ کاتژمێر بە شەمەندەفەر دوور بوو. دوای ٢٦ ڕۆژ، کچەکەم تەواو چاکبوەوە و کەوتنەوە ڕێ بۆ ماڵەوە. کاتژمێر شەشی بەیانی لە وێسگەی شەمەندەفەرێک، کچەکەم زۆری لە براکەی کردبوو تا بچێت هەندێ خەیارشۆری بۆ بکڕێت. کوڕەکەشم پێیوابوو کە تەنها ٥ خولەکی پێدەچێت، بۆیە لە شەمەندەفەرەکە دابەزیبوون و بەرەو فرۆشگەیەک کەوتبووبە ڕێ. لە ناکاو ٥ پیاو هاتبوون و کەوتبونە لێدانی کوڕەکەم. کورەکەم بە تەنها شەڕی لەگەڵ کردبوون، لە کوڕەکەمیان دابوو و کچەکەشمیان فڕاندبوو. چەندین خەڵک لەو ناوە وەستابوون، بەڵام کەسیان نەچووبوون یارمەتی کوڕەکەم بدەن. کچەکەمیان فڕاندبوو و کوڕەکەشم بێ هۆش لەسەر شەقامەکە کەوتبوو. کوڕەکەم ٧ ڕۆژ دواتر، بە هۆی ئەو ڕوداوەوە گیانی لەدەستدا. منیش لەوکاتەوە چاوەڕوانم کچەکەم بێتەوە. هەردەم لە چاوەڕوانیدا دەبم.

– سەیدا خاتوون





لە ناو کێڵگەیەکدا، دوای دورینەوەی بەروبوم، دوو چاوە ماندووە شەست ساڵانەکانی حەمیدە، لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ بۆ خۆراکی ئەو ڕۆژەی دەگەڕێت. ئەگەر جوتیارێک یەک دەنک دانەوێڵە بەجێبهێڵێت، ئەوا ئەم یەک دەنک زیاتر کۆدەکاتەوە. ئەم خاتونە تەنهایە هیچ کەسی نیە، لە کوڕێک زیاتر کە هەرگیز نایەت بۆ سەردانکردنی. لە ئێستادا تەنها بژێوی ژیانی بریتیە لە یەک بە یەک کۆکردنەوەی ئەم ڕزقانە. ئەگەر بتوانێت دوو کیلۆ کۆبکاتەوە، ئەوا دەتوانێت ٣٠ تەکە بەدەست بهێنێت. لە تەمەنی شەست ساڵیدا، ئەمە تەنها ڕێگەی مانەوەیەتی لە ژیاندا.

من چل ساڵ بووم کە ژنەکەم کۆچی دوایی کرد. کچەکەم تەنها هۆکاری ژیانم بوو. هەرگیز بیرم لە دوبارە ژنهێنان نەکردەوە. کە منداڵ بوو، لەگەڵ خۆم دەمبرد بۆ سەر کار. پارەم نەبوو بینێرمە قوتابخانە بۆیە شەوان لەگەڵ خۆم دەمبرد بۆ خوێندنگەی بەساڵاچووان. پێکەوە فێری نوسین و خوێندنەوە بووین. کاتێک بوو بە پازدە ساڵ، داواکارێکی باشی بۆ هات لە گوندێکی دوورەوە. لەبەر هەژاری نەمتوانی هیچی بۆ بکرم، بۆیە ئەو دەفتەرەکەمی وەک یادگاری لەگەڵ خۆی برد. نە من پارەم هەبوو بتوانم سەردانی بکەم، نە ئەویش مێردەکەی ڕێگەی دەدات بێت بۆ لام. کاتی دوگیانییەکەی چوم بۆ سەردانی. دەستی گرتم و پێیگوتم، «ئەگەر من مردم، تۆ منداڵەکەم بەخێوبکە.» من بۆ ئەو کارە سەرزەنشتم کرد و پێم گوت کە وەک منداڵ قسە دەکات. داوای لێکردم ئەو شەوە لای ئەو بمێنمەوە، بەڵام ماڵە غەزورانی ڕێگەیان نەدام بمێنمەوە، بۆیە گەڕامەوە. لە کاتی منداڵبووندا، کچەکەم کۆچی دوایی کرد. ئێستا کچی کچەکەم یەک ساڵانە و من بەخێوی دەکەم.



پێش ئەوەی بچێتە سەر ستەیجەکە، سەیرێکی کردم و گوتی، «من چیتر کچێکی ئاسایی نیم. من ئێستا بەسەر هەمووواندا دەفڕم».

دوای ئەوەی کە هاتە خوارەوە گوتی، «زۆر جار بینەرەکان قسە و توانجی ناشرینمان لێ دەدەن، بەڵام نە من نە کچەکانیتریش گوێی پێ نادەین. بەڵام من دەمەوێت کارێکی گرنگ بکەم، بەڵام چیتر ڕێگە بە خەڵکی نادەم دەست لە ژیان و هەڵسوکەوتم وەربدەن.»

– سێلینا، ٢٣ ساڵ



لە گوندەکەمان هەمیشە لەگەڵ هەموو ئاژەڵەکاندا یاریم دەکرد، زۆریان خۆشدەویستم. ڕەنگە ئێستاش لە هەموو شوێنێک بەدوامدا بگەڕێن. زڕدایکەکەم هەمیشە لێی دەدام و بە گوێمدا دەیچرپاند ئەگەر ئەو ماڵە جێنەهێڵم، ئەوا دەرمانخواردم دەکات. تەنانەت سەگەکانیشم لێی دەترسان. هەرچیم بۆ باوکم دەگێڕایەوە بڕوای پێنەدەکردم. جارێک گوێم لێبوو بە باوکمی گوت، «نازانم بۆ کوڕەکەت لەگەڵ داکیدا نەڕۆیشت.» من نازانم چۆن بچم بۆ لای، هەمووان دەڵێن دایکم چووەتەوە بۆ لای خوا. خۆزگە بمتوانیبایە بچم بۆ لای. دواجار لە ماڵەوە هەڵهاتم و ئێستاش لەم پارکە لەگەڵ ئەم سەگانەدا دەخەوم. تەنانەت ئەو سەگانەش دایکیان هەیە، تەنها من دایکم نییە.



من و خوشکە بچوکەکەم لەگەڵ دایکم پێکەوە دەژین. ئێمە پێنج ژنین ئەوە بۆ چەند ساڵێک دەبێت لە یەک ژوردا پێکەوە دەژین. زۆر قورسە بۆ من پارە لە موچەکەم کۆبکەمەوە و خەرجی نەکەم، بەڵام هەرچۆنێکە هەندێک پارەم لە دەغیلەیەکی بچوکدا هەڵگرتووە. دایکم هەرگیز لەو ژورە بچوکە ناچێتە دەرەوە، تەنانەت ناچێتە کۆڵانیش. کۆڵانەکەشمان پڕە لە ژاوەژاو و دەنگەدەنگ. ئەمەش خەمبارتری دەکات. خوشکە بچوکەکەم هەمیشە پلان دادەنێت بۆ دەرچون لەم جیهانە بچوکەمان. منیش هەمیشە پێیدەڵێم کە پلاندانان بۆ چوونە دەرەوە لەم جیهانە بچوکەمان، کارێکی ئەستەمە و تەنها خەونە. بەڵام دواجار ئێستا پارەمان هەیە و دەتوانین بچین جیهان ببینین. ئێمە دەچین بۆ شارۆچکەی (کۆکسی بازەر). بە پاسێک دەیانبەم ساردکەرەوەی تیابێت و لە ئوتێلێکی زۆر خۆشیش دەمێنینەوە. هەموو ڕۆژێک کە دەگەڕێمەوە خوشکە بچوکەکەم باسی پلانەکانی خۆیمان بۆ دەکات و دایکە نابیناکەشمان لەگەڵمان پێدەکەنێت.

– سەهانە، ٣٠ ساڵ





ڕاهێلا باشترین هاوڕێمە. بەڵام سەرەتا پەیوەندیەکەمان زۆر سەیر بوو. بێوەژنیش بوو و مێردەکەشم زۆر سەرنجی ئەوی دەدا. هیچ کەس خۆشی نەدەویست، بە منیشەوە. هەموو پێمان وابوو کە بێوەژن، هەمیشە خراپە. زۆر بەوە توڕە دەبووم کە ئێواران دەمبینی لە ناو حەوشەکەی ئێمەدا دەوەستا. گومانم هەبوو و دەترسام مێردەکەمم لێ بسەنێت. بەڵام بە تێپەڕبوونی کات، هەمووومان بۆمان ڕوون بووەوە کە ڕاهێلا ژنێکی چەند بەهێزە و ناخی چەندە جوانە. خواردنی بەشی منداڵە هەتیوەکان دەدا و ئەو کاتانەی تام لێدەهات تا بەیانی چاودێری دەکردم. وردە وردە وای لێهات، هەموو خەڵکی گەرەکە هەژارنشینەکەمان خۆشیان ویست چونکە تێگەیشتین کە بێوەژن یان ژن بوون، هیچ پەیوەندییەکەی بە کاراکتەرەوە نییە. من زۆر ڕێزی ئەو دەگرم بۆ ئەو ڕەوشت بەرزیەی. باری خێزانداریی هەرگیز نەیتوانیوە جوانی ناوەوەی ئەو بکوژێت.

- ئامینە(چەپ) بەم جۆرە باسی ڕەهێلای کرد(ڕاست)



کە یەکەم جار لە شاری یاری گوندێکدا بینیم، خەریکی شیرینی خواردن بوو. دەمودەست کەوتمە داوی خۆشەویستییەوە. ئەوکات حەڤدە ساڵ بووم. خۆم و باوکم جوتیار بووین. ئەویش تاکە کچی دەوڵەمەند ترین بنەماڵەی ئەو ناوچەیە بوو. لەبەر ئەوەی کچی ئەو بنەماڵە دەوڵەمەندە بوو، من نەمدەتوانی هیچی پێ بڵێم. هەمیشە و بە نهێنی و بە بێ دەنگی دوای دەکەوتم بۆ هەر کوێیەک بچووبایە. سێ ساڵ تێپەڕی بێ ئەوەی تەنانەت یەک وشەشی لەگەڵ بڵێم. دواتر داواکارێکی زۆر باش و دەوڵەمەندی هات، من دڵنیابووم کە دەبێت لە دوورەوە تەماشای ئاهەنگی هاوسەرگیرییە شاهانەکەی بکەم، بێ ئەوەی هیچم لەدەست بێت. لە شەوی مارەبڕینەکەیدا، لە سەر ڕوبارەکەی نزیک ماڵی خۆمان لە ناو بەلەمەکەمدا دانیشتبووم و لە دڵەوە دەگریام. لە ناکاو کەسێکم بینی بە ڕاکردن بەرەو بەلەمەکەم دێت. خۆی بوو، ئەو بوو. پێش ئەوەی لە هیچ تێبگەم، دەستیکرد بە سەوڵ لێدان و لەوێ دورکەوتینەوە. من هەرگیز، تەنانەت لە خەونیشدا پێم وانەبوو شتێکی وەک ئەمە ڕوبدات لە ژیانمدا. یەکەم شت کە پێی گوتم، گوتی، «گەمژە، تۆ زۆر گەمژەیت.» ئەوە بۆ چل ساڵ دەچێت، هەموو ڕۆژێک پێمدەڵێت گەمژە. من زۆر دڵخۆشم بەم گەمژەییەم.

– مەقبول، ٦٠ ساڵ

یازدە ساڵ بووم کە باوکم دامی بە شوو. هەر لە منداڵییەوە هەستم دەکرد وەک گوناهێک وام بۆ خێزانەکەم. ئایا کچ بوون تاوانە؟ دوای شازدە ساڵ لە هاوسەرگیری، لەم دواییەدا پێنجەم کچم بوو. لەبەر ئەوەی  تەنها کچم دەبێت، مێردەکەم هەڕەشەی لێکردم و دەری کردم. هەستم بە شکست و شەرمەزاری و بریندار بوون دەکرد. کەسایەتیم شکاوە. زۆر ماندووم. ئایا تەنها لەبەر ئەوەی کە کچم دەبێت، ئەم هەموو ئازارە بچێژم؟ ئایا ئەوانیش منداڵ نین؟ ئایا تەنها لەبەر ئەوەی کە ژنم، ئەو هەموو ڕۆژێک لێی دەدام؟

- سەلما، ٢٧ ساڵ



ئێمە هەژار بووین، بەڵام لە ڕووداوێکدا برینداربووم و بۆ نۆ مانگ نەمتوانی کار بکەم. هەموو پێیان وابوو مێردەکەم جێمدەهێڵێت، لە دڵ و ڕوحمەوە دەمزانی کە لەگەڵم دەمێنێتەوە. کات تێپەڕی و هەموو ڕۆژگارە ناخۆشەکانمان تێپەڕاند. بە درێژایی ئەو نۆ مانگە، مێردەکەم دوای گەڕانەوەی لە کار، خواردنی دروست دەکرد. ئێستا تەواو چاکبوومەتەوە، بەڵام هێشتا هەر ئەو خواردن دروست دەکات. دراوسێ و ماڵە غەزورانم زۆر گاڵتەی پێدەکەن، بەڵام گوێیان لێ ناگرێت. پێمدەڵێت ئەگەر تۆ بتوانیت چەندین ساڵ خواردن دروست بکەیت، ئەی بۆ من نەتوانم خواردن بۆ تۆ دروست بکەم. زۆر بەختەوەرم کە ئەوم هەیە لەم دونیایەدا.

- فاتمە ئەختەر، ٢٣ ساڵ





لە ئێستادا کاتم نییە زۆر قسەت لەگەڵ بکەم.
بێزەحمەت دەتوانیت پێمبڵێیت ئێستا کاتژمێر چەندە؟
ئێمە لە ماڵەوە هیچ جۆرە کاتژمێرێکمان نییە. هەموو
ڕۆژێک من یاخود خوشکەکەم، دەچین بۆ ماڵی
دراوسێیەکمان، تا بزانین کاتژمێر چەندە. قوتابخانە
لە ماڵمانەوە یەک کاتژمێر دوورە. هەندێک جار دوا
دەکەوین چونکە نازانین کاتژمێر چەندە و قورسیشە
پێشبینی بکەین.

- ڕەیسوڵ

ئەوە بۆ شەش مانگ دەبێت، دایک و باوکم نەیانتوانیوە کرێی خوێندنەکەم دابین بکەن. هەموو ڕۆژێک مامۆستا لە بەرچاوی قوتابیەکان ناوم دێنێت و دەڵێت پارەکەت بێنە. من بەو ناوهێنانە زۆر تەریق دەبمەوە. کاتێک بە دایکمم گوت کە من چیتر نامەوێت بچمەوە بۆ قوتابخانە، پێی گوتم کە هەمیشە خودا بە ئازار و بێتاقەتی تاقیمان دەکاتەوە. ئەگەر تا کۆتایی کۆڵ نەدەین و بە پێکەنینەوە بجەنگین، ئەوا خودا ڕەحممان پێدەکات و خۆشبەختمان دەکات. منیش بڕوام بەو قسانەی دایکم هێنا و ئێستا پێموایە خودا لەگەڵمدایە و تەنها تواناکانم تاقی دەکاتەوە.

– موشکان، ١١ ساڵ



(تێبینی: لە ئێستادا بە هاوکاری پرۆژەکانی ئاکاش و لە ڕێگەی خێرخوازانەوە، پارەی خوێندی موشکان و سەدەها منداڵی دیکە دابین دەکرێت)

هەرچی ئەرکی سەر شانی پیاوبێت من کردم. لە منداڵییەوە دڵخۆشیەکانی خۆم دەکرد بە قوربانی و شتە-یارییەکانی خۆمم دەدا بە خوشکەکەم. لەسەر داوای باوکم چوم ماتماتیکم خوێند، ئەگەر چی خۆم حەزم لە هونەر بوو. لە ماڵەوە بەپێ لە ئۆفیسەوە دەچومەوە بۆ ماڵەوە، تەنها بۆ ئەوەی بتوانم ژەمێکی باشتر بۆ منداڵەکانم دابین بکەم. زۆر بە دەگمەن جەژنان شتم دەکڕی، بەڵام هەمیشە دیاریم بۆ خێزان و خزمەکانم دەکڕی. لە ڕێگەی نەخواردنی نانی نیوەڕۆ و ڕۆشتنەوە بۆ ماڵەوە بە پێ، توانیم هەندێک پارە کۆبکەمەوە. دواتر ئەو پارەیەم دا بە ماتۆڕسکیلێک بۆ کوڕەکەم و کۆمپیوتەرێک بۆ کچەکەم. چەند ئێوارەیەک کاتی نانخواردن گوێم لێدەبوو کە دەیانگوت من باوکێکم ناتوانم هیچ خۆشبەختیەکەک بۆ خێزانەکەم دابین بکەم. ئەوەی کە کردومە تەنها ئەرکی باوک بووە. هەموو باوکەکانی دیکە لە من باشترن و لە من زیاتر خۆشبەختیان بۆ خێزانەکانیان دەستەبەر کردووە. ژنەکەم کۆچی دوایی کرد و سێ ساڵ دوای ئەوەش منداڵەکانم چونە ماڵ و حاڵی خۆیانەوە. ئێستا خزمەتی خودا دەکەم و خۆم تەرخان کردووە بۆ ئەو. ئەو ژیانەی کە ماومە لە گەڕان بەشوێن ئەودا دەیبەمە سەر. دواجار ئەو ئازایەتیەم بەدەست هێنا کە شوێن ئەوە بکەوم کە دڵم دەیخوازێت. هەرچۆنێک بێت، بە هیچ جۆرێک لە هیچ شێوازێکی ژیانکردن پەشیمان نیم.

- موختار حسێن، ٨٠ ساڵ، سێ ساڵ دەبێت لە مزگەوتێکدا دەژی و خزمەتی مزگەوتەکەش دەکات



پێم مەڵێ خوشکێ. نامەوێت وەک خوشکبم. تەنها شەش ساڵ بووم کە باوکم لە وێستگەی شەمەندەفەرێکدا جێیهێشتم و خۆی ڕۆیشت. ئێستاش وا لەم سۆزانیخانەیەدا کار دەکەم. بۆیە چیتر پێمەڵێ خوشکێ.

- پورنیما، ١٨ ساڵ





هەندێ جار دەچم بۆ سەردانی ژنی پێشووم. بەڕاستی هیچ کەسی دیکەم نییە سەردانی بکەم. هەموو دەڵێن ئەو ژنێکی خراپە، بەڵام من دەزانم بارودۆخی چۆن بوو، بۆیە یەک چرکەش لۆمەی ناکەم. چەندین ساڵ پێکەوە بووین نەمتوانی تەنانەت یەک عەزیشی بۆ بکڕم. چەندین ڕۆژ لەگەڵ من برسێتی بەڕیدەکرد. تەنها منداڵێکمان هەبوو، بەڵام ئەویشمان لەدەست دا چونکە پارەم نەبوو چارەسەری پێبکەم. دواجار کە سەردانم کرد، شیرینی داپێم. هەمیشە لە ژورەکەیدا شیرینی هەڵدەگرێت. ڕەنگە لە یادی نەکردبێت کە چەندم حەز لە شیرینییە. ئەگەر بمتوانیبایە خواردن بۆ منداڵەکەم دابین بکەم و چارەسەری نەخۆشیەکەی بکەم، ژیانم زۆر جیاوازتر دەبوو. هەموو پێی دەڵێن سۆزانی، بەڵام ئەو بۆ من هەر ژنە ئازیزەکەی جارانە.

– کۆمێش

هەمیشە هەستم کردووە کە لەم جیهانەدا شوێنێک بۆ خۆشویستن و گرنگیدان بە مرۆڤ نەماوە. خۆزگەم دەخواست هەڵەبم، بەڵام کاتێک تەماشای دەوروبەرم دەکرد، دەمبینی کە خەڵکی گرنگی بە ئازار و مەینەتیەکانی یەکتر نادەن. هەرگیز کەس لێتناپرسێت ئایا برسیت نییە؟ تینوت نییە؟ لەبەر ئەمە بڕیارم دا کە شوێنێک لە خۆمدا بهێڵمەوە بۆ خۆشویستن و گرنگیدان بەوانیتر. خواردنم دەدا بە ئاژەڵەکان، ئاوم دەدا بە برسییەکان. پێکەنینم بۆ ماندوبووەکان دەکرد و لەگەڵ ئەو کەسانە دەمامەوە کە پێویستییان بە هاوڕێیەک بوو پشتیان بگرێت. ئەو ڕۆژەی براکانم لە ماڵ دەریانکردم سەرم سوڕما. ئەستەم بوو بڕوا بکەم لە ماڵەکانیاندا شوێنێک نیە بۆ خوشکێکی بێوەژنی دووگیان. منیش بێ پارە بووم و هەستم دەکرد زەوی لە پێمدا نەماوە. دەزانیت چۆن نەمردم و لە ژیاندا مام؟ لە کۆلانێکی هەژارنشیندا، کەلەبەرێکم دەستکەوت و لە ناو ئەو خەڵکە نەناسەدا پشومدا. سواڵکەرەکان یارمەتیاندام ئیشێک بدۆزمەوە. ژنێکی تەنها چاودێری دەکردم و خواردنی دەدامێ. هەرگیز ئەو ڕۆژەم لە یاد ناچی کە منداڵەکەمم بوو. بردیانم بۆ لای بەتەمەنترین ژنی ئەو شوینە. ژنێکی سەد ساڵان پاکی دەکردمەوە و نەوازشی دەکردم. هەستم بە هیچ ئازارێک نەکرد، بەڵام هەستم بە چەند شەپۆلێک دەکرد، شەپۆلی سۆز، خۆشەویستی، بڕوا، خیانەت. هیچ کەسێکی لێنەبوو بە خوێن خزمم بێت و پیرۆزبایی منداڵبوونەکەم لێبکات. بەڵام چەند ژنێکی نەناسراوی لێبوون کە ناوکی منداڵەکەمیان بڕی و یارمەتیان دام منداڵەکەم لە ئامێزبگرم و بینێم بە سنگمەوە. من هەڵە بووم خۆشەویستی لەسەر زەوی ماوە. ئەو کەسانەی کە تامەزرۆی خۆشەویستین، بێ بەرامبەر خۆشەویستیت پێدەبەخشن.

– دایکی ئالۆ



من زۆر تووڕەم چونکە دایک و باوکم هەمیشە شەڕیانە. دوێنێ دایکم قاپێکی دا بەسەری خۆیدا و قاپەکەی لەسەری خۆیدا شکاند. ئەو خوێنی لێ دەڕۆیشت و منیش زۆر دەترسام. چووم خوێنبەربوونەکەی بوەستێنمەوە بەڵام بە قایمی پاڵی پێوەنام و نەیهێشت. باوکم هەمیشە تووڕەیە. نازانم کامیان زۆر لە کامیان دەدەن، بەڵام هەمیشە شەڕدەکەن. ئەمڕۆ خۆم فڕێدایە سەر ئەم شەمەندەفەرە و حەزیش ناکەم بچمەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام هەر دەبێت بڕۆمەوە. چونکە هیچ شوێنێکی دیکەم نییە بۆی بچم.

– ئیمون



لەماڵەوە بووم و دەگریام، چونکە ئاوی لافاوەکە دەوری ماڵەکەمانی گرتبوو. زۆر دەترسام شتومەکەکانمان لەدەست بدەین. خەمی ئەوەشم دەخوارد کە چیتر ناتوانم بچم بۆ قوتابخانە. کاتێک باوکم ویستی بچێت بۆ سەر کار، سەیرێکی منی کرد و لێی پرسیم، «ئێستا کاتی قوتابخانەیە، تۆ چیدەکەیت لە ماڵەوە؟» منیش پێمگوت کە چۆن دەتوانم بچم بۆ قوتابخانە لە کاتێکدا هەموو ماڵەکەمان دەبێت بەژێر ئاوەوە و لافاو هەموو شتەکانمان دەبات. باوکیشم پێیگوتم کە ئەو بە هۆی لافاوەوە لە چوون بۆ کار نەوەستاوە، دایکم بە هۆی لافاوەوە لە خواردن دروستکردن نەوەستاوە، بۆیە منیش نابێت بە هۆی لافاوەوە لە چوون بۆ قوتابخانە بوەستم. ئینجا دڵنیای کردمەوە کە منیش هێندەی ئەو بەهێزم. بۆیە هەرچی ڕووبدات نابێت لە چوون بۆ قوتابخانە بوەستم. لەو کاتەدا (لەیلا) ی هاوڕێم هات بۆ ماڵمان و پێی گوتم کە ئەو ناوێرێت بە تەنها بچێت بۆ قوتابخانە. من لە پێشەوەی دەڕۆم و ڕێنیشاندەریم، لەیلاش هێندەی من بەهێزە.



- ڕۆکسانا، ٨ ساڵ



من و دایکم ڕۆژانە کاتژمێر چوار لەخەو هەڵدەستین، ئەو کاتەی کەزۆربەی بارهەڵگرەکان دەگەنە بازاڕ. ئێمە بە نهێنی چاودێری بارهەڵگری سەوزەواتەکان دەکەین. کاتێک کۆڵکێشەکان شتەکان باردەکەن، نیوەی سەوزەواتە گەنیوەکان فڕێدەدەن. ئەمە ئەو شتەیە کە ئێمە چاوەڕێی دەکەین؛ زۆرجار چەند کاتژمێرێکیان پێ دەچێت تا هەموو شتەکان دەگوازنەوە. دایکم ئازار لە ئەژنۆکانیدا هەیە، ئەو کاتانەی ئەوان سەوزەواتە خراپ بووەکان فڕێدەدەن، ناهێڵم بچێتە ژێر بارهەڵگرەکان و دانە بە دانە سەوزەواتە ماوەکان کۆبکاتەوە، بۆیە خۆم دەچم. بەخێرایی دەڕۆم و کۆیان دەکەمەوەو دەیاندەم بە ئەو. بەمجۆرە بەیانیان سەوزەی تەواومان هەیە تا لە مارکێتە خۆجێییەکان بە خەڵکە هەژارەکەو بە نرخێکی کەمتر بیفرۆشین. داهاتی ڕۆژانەمان ئەوپەڕی سەد تەکەیە، بەڕاستی هیوا دەخوازم زیاتر یارمەتی دایکم بدەم بەڵام لە ئێستادا ئەوە هەموو ئەوەیە کە پێم دەکرێت.

– شووفیە، ١٢ساڵ

نەوەکەم ٦ ساڵانە، ڕۆژێک لێمی پرسی: «بوبو، تۆ چەند ساڵی؟»
وتم: «دوای تەمەنی ٧٠ ساڵی هەموو کەسێک منداڵە، منیش بە هەمان شێوە.»

– بیلو بوبو



من و دایکم ڕۆژانە ئاو دەدزین، بەڵام لە ناچاریدا وادەکەین. لە هیچ شوێنێکی دیکەوە ئاومان دەست ناکەوێت. دایکم هەموو ڕۆژێک لە بەیانی زووەوە دەڕوات بۆ سەر کار و منیش دەبیت بچم بۆ قوتابخانە. ئەگەر لە نۆرەی وەرگرتنی ئاودا بوەستین، ئەوا دەبێت چوار بۆ پێنج کاتژمێر نۆرە بگرین ئینجا دەتوانین یەک سەتڵ پڕ بکەین لە ئاو. هەروەها ئێمە لەبەر ئەوەی لە دەرەوەی کۆڵان دەژین، کەواتە مافی ئەوەمان هەیە ئاو بدزین. لە دەرەوەی کۆڵان لای سکەی شەمەندەفەرەکە لە پلاستیک کوخێکمان دروست کردووە. دەزانم ئیستا تۆ زۆر بە خراپی بیرمان لێ دەکەیتەوە، بەڵام بەبێ ئاو چی بکەین؟ هەموو ڕۆژێک دوای نوێژی بەیانی، من و دایکم دێین بۆ ئەم وێستگەی شەمەندەفەرە. ئەم بۆری ئاوە بەکاردێت بۆ پاککردنەوەی شەمەندەفەرەکان. هەمیشە دە خولەکم پێ دەچێت تا بە بۆرییەکەدا هەڵدەگەڕێم و ئاو دەکەمە ناو سەتلەکەوە. زۆر بە دەگمەن دەتوانین دوو سەتڵ پڕ بکەین لە ئاو، ئەگەر دوو دانە پڕ بکەین، ئەوا تا نیوەڕۆ بەشمان دەکات. هەندێ جار دایکم زۆر لەوە بێتاقەت کە دەبێت بۆ هەموو شتە سادەکانی ژیانمان شەڕ بکەین، بەڵام من هەمیشە پێی دەڵێم کە ڕۆژێک دێت دەبین بە خاوەنی ماڵی خۆمان و منیش گەرماوێکی خۆشی بۆ دروست دەکەم تایبەت بە خۆی، تا بتوانێت بە ئارامی و بێ پەلەپەل خۆی تێدا بشوات. خانویەک کە چیتر پێویست نەکات تا درەنگانێک لە سەرەی تەوالێتدا بوەستین. ڕۆژێک دێت شتەکان زۆر جیاوازبن لە ئێستا. من لەبەرئەوەیە دەچم بۆ قوتابخانە.

– بابو



من کوڕێکی زۆر شەرمنم. من هاوڕێم زۆر نییە، بەڵام چەند هاوڕێیەکی تایبەتیم هەن. با بە یەکێک لە هاوڕێ نزیکەکانمت بناسێنم. ڕاجە. من چاودێریم و هەموو ئێوارانێک بە یاریکردن لەگەڵ ئەو دەبەمە سەر. باسی هەموو شتێکی ژیانی خۆمی لەگەڵ دەکەم. هەست دەکەم ئەو لێمتێدەگات و بە شێوەی خۆی وەڵامم دەداتەوە. ئەمڕۆ زۆر بێتاقەت بووم. دواتر وەک هەمیشە هات و بۆنی پێوەکردم. دەتەوێت بیبینیت کە هاوڕێکەم چۆن دڵسۆزیی خۆیم پیشان دەدات؟ سەیرکە.

- ئەشرەف



یازدە منداڵمان هەیە. هەموویان بە یەک چاو سەیردەکەین و یەک خۆشەویستی دەدەین بە هەموویان. منیش وەک جوتیارێک، هەرچیم لە توانابووبێت کردومە تا ئەوەندەی بتوانم هۆکارەکانی ژیانیان بۆ دابین بکەم. ڕۆژگارێک هەبووە کە من و ژنەکەم لەگەڵ هەر یازدە منداڵەکەماندا پێکەوە دەخەوتین. ڕەنگە ئەمە قسەیەکی شێتانە بێت بۆ ئەم تەمەنەی من، بەڵام کاتێک منداڵەکانمان بە سۆزەوە لە ئامێزیان دەگرتین، هەموو ئازارەکانمانمان بیر دەچووەوە. من و ژنەکەم تەنانەت یەک جاریش شەڕمان نەکرد لە ژیانماندا. من و ژنەکەم و یازدە منداڵەکەم، ساڵی جارێک دەچوین بۆ شاری یاری گوندەکە. پارەیەکی کەممان هەبوو، بەڵام هەرگیز هەژار نەبوین. کات تێپەڕی و منداڵەکانم گەورە بوون و هەر یەکە و کەوتنە شوێنێکی جیاوازەوە. ململانێ لە نێوانیاندا دروست بوو بە هەمووشیان ئێمەیەیان تاوانبار دەکرد کە نەمانتوانیوە هۆکارەکانی ژیانیان بە پێی پێویست بۆ دابین بکەین. بە هەمویان نەیانتوانی کاتەکانیان پێکەوە بگونجێنن و هەموویان پێکەوە سەردانمان بکەن. ژنەکەم لەسەر جێگەی مەرگ بوو، چاوەڕوانیان بووین هەموویان بێن بۆ سەردانمان، بەڵام نەهاتن. ڕەنگە پێیان وابووبێت، ئەمە فێڵە تا هەموویان کۆبکەینەوە. ژنەکەم گیانی دەدا و منیش بەردەوام پێمدەگوت کە هەر چرکەیەک بێت منداڵەکانمان دێن بۆ سەردانمان. دوا قسەی ژیانی کە کردی، وتی «کە هاتن پێیان بڵێ با ئەمشەو لێرە بمێننەوە و هەموومان پێکەوە بخەوین.»

- دۆنو





ئەمە بۆرییەکەی ئاوی دزی و نایاساییە. چوار کاتژمێر چاوەڕوانم کرد تا نۆرەم هات. ئێمە ناتوانین لە نزیکی ئەم بۆرییە ڕیزبگرین و چاوەڕوانی نۆرەی خۆمان بکەین، چونکە دەترسین کەسێک بمانبینێت و ئەم بۆرییە ئاوەمان لەدەست بچێت. بۆیە لە کۆڵانە هەژارنشینەکەی خۆمانەوە نۆرە دەگرین. دوای سێ ڕۆژ چاوەڕوانیکردن، ئینجا توانیم ئاوێک بکەم بە خۆمدا و خۆم بشۆم. هەستێکی وەک بەهەشتی هەیە، کاتێک ئاو بە جەستەتدا دەچێتە خوارەوە و لەگەڵ خۆیدا هەموو ماندویی و بێزارییەکان لەگەڵ خۆی دەبات. ڕەنگە ئاو توخمێکی سادەبێت بۆ ئێوە، بەڵام من دوای پڕکردنی هەر سەتڵێک سوپاسی خودا دەکەم. کاتێک دەست لە هەر دلۆپێک دەدەم، لە خۆشیدا بە پێکەنینەوە سوپاسگوزاری خۆم دەردەبڕم.

– ڕەشیدە



دایکم هەمیشە هەستی بە شەرمەزاری دەکرد، بە هۆی ڕەنگی پێستییەوە. هەمیشە خەڵکی بە شێوازی جیاواز جیاواز تانەیان لێدەدا و ئازاریان دەدا. شەرم لە ڕەنگی پێست، ببوو بە ئازارێک، هەموو ڕۆژێک پێوەی دەتلایەوە.
گەورە بووم و ڕۆژ بە ڕۆژ دەمبینی دایکم هەمیشە لە ژیانێکی نائارامدایە. دەمبینی بە هۆی زۆری کێش و ڕەشی ڕەنگی پێستییەوە هەمیشە ئازاری دەچەشت. لەمەوە وانەیەک فێربووم، «نابێت زۆر گرنگی بە قسەی خەڵکی بدەین.»
ڕۆژێک پورم پێی گوتم کە منیش وەک دایکم ڕەشم. منیش بە پێکەنینێکی گەشەوە وەڵامم دایەوە، «وەک دایکیشم جوانم.» من هەست بە جوانی دەکەم، لە ناخ و لە ڕووخساریشمدا. نامەوێت هیچ جۆرە کرێمێک بەکار بهێنم تا ڕەنگم سپی دەربکەوێت. دەمەوێت جوانییەکەم بە پێکەنینەکەم پیشان بدەم و ئەو هێزەش نەدەم بە هیچ کەسێک کە جوانیەکەم تێکبدات.

- سافییە



هەرگیز هیچ کەسم نەبینیوە لە عالییە جوانتر بێت. من بیست ساڵ بووم کە هاوسەرگیریمان کرد. دایک و باوکم کە یەکەم جار بینیان سەریان لە جوانییەکەی سوڕما. عالییەی من هەر وەک منداڵێک وابوو. هەمیشە بەبێ هۆکار دەگریا. ڕۆژانە بە دزی دایک و باوکمەوە، بوکەشوشەی قوڕینم بۆ دێنا و ئەویش بە ڕۆژ دەیشاردنەوە. ئێمە پێکەوە کارمان دەکرد و هاوپیشە بووین و هاوڕێش بووین ئینجا ژنومێردیش بووین. هەمیشە جۆلانێیەکم بۆ دروست دەکرد و لەسەر درەختەکان بۆم هەڵدەواسی. ئەو ماوەیە بۆ من، خۆشترین ساتەکانی ژیانم بوون. دوای دوو ساڵ، ئەو نەیتوانی ببێت بەدایک. لەبەرچاوی هەموو کەس ئەو لە فریشتەوە بوو بە جادوگەر بە دایکم و باوکیشمەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر نەخۆش دەکەوت. ئەو پێستەی کە لە ڕەنگی گوڵ دەچوو، وردە وردە قاوەیی بوو. باوکم ناردییەوە بۆ ماڵی باوکی. من لە پەنجەرەی ژورەکەمانەوە سەیرم دەکرد و کەس نەیدەبینیم کە لە خەفەتدا دەمردم. بەڵام لە ترسی باوکم نەمدەوێرا هیچ بڵێم. عالییە تەنانەت یەک جاریش ئاوڕی نەدایەوە. چەندین مانگ تێپەڕی. ڕۆژێک هاوڕێیەکەم نارد تا هەواڵێکیم بۆ بێنێت. پێی وتم کە نەخۆشیەکی زۆر خراپی خوێنی هەیە و براوە بۆ نەخۆشخانە بۆ چارەسەر. چەندین شەو خەونم پێوە دەبینی و هەمیشە دەهاتە خەونم. ڕۆژێک باوکم زۆری لێکردم کە بچم بۆ ماڵی پورم. دواتر کە هاتمەوە، زانیم کە من چوبووم بۆ ماڵی پورم، عالییە هاتبوو بۆ سەردانم تا بۆ دواهەمین جار بمبینێت. لە هەمووان پاڕابووەوە تەنها بۆ ئەوەی ڕێگەی بدەن یەک جار من ببینێت. دواجار دایک و باوکم ڕێگەیان دابوو کە تەنها بۆ چەند ساتێک بچێتەوە ژوورەکەمان. بووکەشوشە قوڕەکانیشی بۆ بەجێ هێشتبووم. عالییە حەوت ڕۆژ دوای ئەو سەردانە، کۆچی دوایی کرد. خێزانەکەی ڕێگەیان نەدام لاشەکەی ببینم.

دواتر من هاوسەرگیریم کردەوە و ئێستا خاوەنی کوڕەزا و کچەزاشم. خێزانەکم زۆر گەورەیە و زۆر قەرەباڵغین، بەڵام دەمەوێت یەک شتت پێ بڵێم «لە دڵی هەموومان‌دا شوێنی کەسێک هەیە کە هەرگیز هیچ کەسێکی دیکە ناتوانێت شوێنی بگرێتەوە. کاتێک ئەو کەسە لە دڵماندا کۆچ دەکات، بۆ هەمیشە تەنها دەبێت. ئەمە چیرۆکی من و یەکەم خۆشەویستیمە.»

– شاهجەهان



من باش نیم. بەهۆی خەونی ناخۆشەوە شەوان ناتوانم بخەوم. هەموو شەوێک بە گریانەوە خەبەرم دەبێتەوە. باوکم و دایکم لەگەڵ من دەخەون تا چیتر نەترسم. دایکم چاوەزارێکی بۆ هێنام. ئێستا لە هەموو شت دەترسم، بەڵام بۆ کامێراکە پێدەکەنم بۆ ئەوەی جوان دەربچم. نامەوێت وەک کچێکی بێ ئەقڵ دەربکەوم کە لە تارمایی دەترسێت. تۆ دەڵێیت چی؟ جوانم؟

– سێلۆنی

بۆ کچەکەم دەگەڕێم. ئەوە بۆ پازدە کاتژمێر دەچێت دیار نییە. داوای هاوکاری لە کەس ناکەم. دەزانیت ئەگەر خەڵکی ئەم دورگەیە بزانن، لە بری یارمەتیدانم، دەزانیت چی دەکەن؟ هەڵدەستن بە هەڵبەستنی چەند چیرۆکێکی خراپ لەسەر کچە هەرزەکارەکەم. کاتی لافەوەکەی پێشوو، ئەوە ڕویدا لەگەڵ ساپنادا هەمان شتیان کرد. ساپنا کچێکی دوازدە ساڵ بوو. کاتێک لافاو چوبووە ماڵەکەوە، باندێکی منداڵ دزیش چووبوون و کچەکەیان فڕاندبوو. خەڵکی گوندەکە دەیانگوت کە کچەکە لەگەڵ کوڕێکدا هەڵهاتووە. دواتر کچەکە توانیبووی لەدەست ئەو پیاوە دڕندانە هەڵبێت و بێتەوە ماڵەوە، بەڵام چیرۆکە بەردەوامەکانی خەڵکی گوندەکە وایان کرد کچەکە بە ناچاری هەڵبێت. نامەوێت هەمان شت لەگەڵ ئەم کچەم دوبارەبێتەوە. بە تەنها بۆی دەگەڕێم. خانووەکەم و کێڵگەکەم و هەموو کەل و پەلەکانم لەدەست دا، بەڵام هەرچۆنێک بووە ڕێگە نادەم کچەکەم لەدەست بدەم و دەیدۆزمەوە.



- دیلارا

کاتێک حەوت ساڵ بووم، دایکم و باوکمم لەدەستدا. ئەوکاتە خوشکەکەم تەنها دوو ساڵ بوو، پێکەوە لە ماڵی باپیرم گەورەبووین. هەر لە منداڵییەوە من هەموو جیهان بووم بۆ خوشکەکەم. کاتێک گەورە بوو، دام بە شوو بە دراوسێیەکی خۆمان. بەڵام نەیتوانی لە من دووربێت. بۆیە لەتەنیشت خانوەکەی خۆمەوە، خانویەکیشم بۆ ئەوان دروست کرد. بەڵام هەر لەو ڕۆژەوە کە ژنم هێنا، ماڵەکەم بوو بە گۆڕەپانی جەنگ. هەموو ڕۆژێک ژنەکەم و خوشکەکەم لەسەر من دەیانکرد بە شەڕ. کاتێک گلەییان لەیەک دەکرد، من تەنها پێیان پێدەکەنیم. ڕۆژێک هەردوکیانم بانگ کرد و پێمگوتن کە بەم نزیکانە ژنی دوهەم دێنم و هەموو شتێکم ئامادە کردووە بۆ ژنهێنانەکەم. پێش ئەوەی ژنەکەم هیچ کاردانەوەیەکی هەبێت، خوشکەکەم کەوتە لێدانم و چەند جارێکیش بورایەوە. دواتر باوەشی کرد بە ژنەکەمدا و پێیگوتم ئەگەر ژنەکەم بەجێبهێڵم، ئەو خۆی دەکوژێت. دوای ئەوەی کە بە پێکەنینەوە پێمگوتن کە ئەوە تەنها گاڵتەیەک بووە و ویستومە پەیوەندیەکەی نێوانیان تاقی بکەمەوە، بە هەردوکیان کەوتنە لێدانم و جیگاکەیان کردمە دەرەوە و ئێستا ئەوان پێکەوە دەخەون و منیس لە ناو کێڵگەکە. ئێستا ئەوان هەموو ڕۆژێک بەیەکەوە شەڕ لەگەڵ من دەکەن. ئەم شەڕەش بەردەوام دەبێت تا ئەو کاتەی یەکێکیتر دەدۆزنەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵی هاهاها.

– سەلیم



چ ناوێکمت پێ بڵێم؟ ناوە باشەکەم یان ناوە خراپەکەم؟ هەموو پێمدەڵێن (کوڕەچەنەبازەکە) ناوە باشەکەشم ڕۆجا مۆنی یە. لە پۆلی یەکم. هاهاهاها لە ڕاستیدا کچانی تەمەنی من لە پۆلی یەک دەخوێنن، بۆیە پێمخۆشە بە هەموو کەس بڵێم لە پۆلی یەکم. شەوان دەچم بۆ ماڵی دراوسێکەمان و زۆر هەوڵ دەدەم ئەلف و بێ فێربم. خۆم خواردنی خۆم دابین دەکەم. ئەگەر ١٠٠ خشت بشکێنم، ئەوا ٩٥ تەکە وەردەگرم. بەڵام زۆر بە زەحمەت دەتوانم تا خۆرئاوا بوون ٧٠ دانە بشکێنم. زۆر بێتاقەت دەبم کاتێک ئێوار خاوەن کارەکەم دێت و خشتەکان دەشکێنێت و پارەی کەمم دەداتێ. دایکم زۆری خۆشدەوێم. جەژنی پێشوو کە تۆ عەزیەکت داپێی. لە ناوەڕاستدا کردی بە دوو پارچە و دوو کراسی بۆ من لێ دروست کرد و هەروەها بۆینباخێکیش. بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا ئەو جەژنە کراسی تازەم لەبەر کرد.

- ڕۆجا مۆنی، ٦ ساڵ





نازانم جارێکیتر خانوکەمان دروست دەکەینەوە یان نا. منداڵەکانم هیوایان لەدەست داوە و پێیان وایە چارەنوسیان بە نەفرەت کراوە و هیچ هیوایەکیان بە ژیان نەماوە. بەڵام من پێمگوتن کە هەرگیز هیوا لەدەست مەدەن. من زۆر سوپاس گوزارم کە هەموو منداڵەکانم لە ژیاندان. دوو رۆژ پێش ئێستا، کوڕەزا ونبوەکەشمان دۆزییەوە. ژیان دەتوانێت زۆر لەمەی ئێستاش قورستربێت. من سوپاس گوزارم کە ئەگەر چی ماڵەکەم و کەلوپەل و یادگارییەکانمانم لەدەست چوو، بەڵام خۆمانمان لەدەست نەداوە و هەموو زیندوین. کە هەڵدەستم لە خەو و دەبینم هەموو لە دەورمن و زیندون، دڵم پڕ دەبێت لە سوپاسگوزاری.

– خەدیجە، ٩٠ ساڵ

نزیک مەبەرەوە، زۆر مەترسیدارە. لێرە دەبێت زۆر ئاگات لە خۆت بێت. من باشم، من چیتر لە ئاگر و کڵپە ناترسم. ئەوە بۆ حەوت ساڵ دەچێت من ئەم کارە دەکەم. لە ڕاستیدا کاتێک پێویستت بە کار دەبێت گوێ بەوە نادەیت ئایا کارەکەتت بە دڵە یان نا. من برای سێ خوشکم. دوو خوشکم دەچن بۆ قوتابخانە. ئەوان جیهانی منن. کاتێ دەچمەوە ماڵەوە، ئەوان پەڕەی تاقیکردنەوەکانیانم پیشان دەدەن. من لە هیچ تێناگەم، بەڵام هەمیشە دەستوخەت و نوسینەکانیان ماچ دەکەم. دەمەوێت بخوێنن و پەروەردەبن. لە مانگی پێشووەوە، کاتژمێرەکان کارکردنی خۆمم زیاد کرد. چونکە خوشکێکم دەبێت بچێت بۆ لای مامۆستای تایبەت. شەوان خوشکە بچوکەکەم دەستم بۆ دەشێلێت. کاتێک لێی دەپرسم بۆ وادەکات، هەمیشە دەڵێت، «چونکە خۆشم دەوێیت.» منیش هیچ ناڵێم. حەزناکەم خۆشەویستیەکەی خۆمی پیشان بدەم.

- ڕەیهان، ١٤ ساڵ



ناوم ڕاسێڵە. نازانم کێ ناوی ناوم. من هەتیوم. ئەوە چوار ساڵ دەبێت لەسەر شەقامەکان دەژیم. کاتێک هاتمە دەکە بریندار بووم و برسیشم بوو. بەڵام کەس گرنگی بە برسیەتی کوڕێکی سەر شەقامەکان نادات. چەند ڕۆژێک دەگریام چونکە دەمویست کەسێک گرنگیم پێبدات و بە بزەوە بمدوێنێت. بەڵام خەڵکی کاتیان نییە بۆ یەکتر خۆشویستن. لەبەر ئەوە من دەستم کرد بە خۆشویستنی هەموو کەسێک. من گرنگیم بە منداڵەکانی هاوڕێی سەر جادەم دەدا و خواردنم لەگەڵ بەش دەکردن. دەمەوێت ئەم هاوڕێیەم بناسیت. ناوی کوتوم-ە. واتە میوان. و ئێستا ئەو میوانی منە. برینەکەیم بە خۆشەویستی چاککردەوە و ئێستاش قسەی لەگەڵ دەکەم. ئاگام لێی دەبێت تا ئەو لەلام دەمێنێتەوە. بەڵام من هەرگیز ئەو بەجێناهێڵم. چونکە دەزانم هەستی تەنهایی و خۆشنەویستن چۆنە.



کاتێک منداڵی دوهەممان حەوت مانگان بوو لە سکمدا، مێردەکەم جێیهێشتم. وەرزێکی باراناوی بوو. من و منداڵەکەم چەندین ڕۆژمان لەبەر بارانەکە بەسەر برد و بۆ پەناگەیەک دەگەڕاین. من بە خۆمم دەگوت، ڕۆژگاری سەخت و باراناوی تەواو دەبێت. ئێستا چیتر ئەو ڕۆژانە تێپەڕیون. ئێستا جێگەمان هەیە لەسەری بخەوین، سەقفمان هەیە لە باران بمانپارێزێت، وەرزی باران کۆتایی هات.

- جوبەیدەو منداڵەکانی





خوێندکاری ماستەرم لە بزنسدا و ئەمە دوا سمستەرمە. ئەوە بۆ شەش ساڵ دەچێت حیجاب دەپۆشم. لەبەر ئەوە ناپپۆشم کە مۆدێلە و لێمجوانە، لەبەر ئەوەش نا کە من کەسێکی کۆنسەرڤاتیڤم، لەبەر هیچ کام لەو هۆکارانە نییە. ئیسلام هانی ژنان دەدات کە تا جلوبەرگی شیاو بپۆشن و داوا لە ژن دەکات کە سەر و جەستەیان دابپۆشن، کاتێک دەچنە دەرەوە بۆ ناو خەڵکی. من بە حیجابەوە زۆر ئاسانتر دەچمە دەرەوە و هەست بە دڵنیاییەکی زیاتر دەکەم.

– ناهیدە هاقو

ئەوە بۆ ساڵێک دەچێت من لە قوتابخانە هێنراومەتە دەرەوە تا چاودێری برا تازە لەدایک بووەکەم بکەم. چونکە دایک و باوکم لە کێڵگەیەک کار دەکەن و هیچ کاتیان نییە. بۆیە چاودێریکردنی ئەو برایەم کەوتە سەر من. چەندین ڕۆژ بە دزییەوە دەگریام کاتێک دەمبینی خزمەکانم و هاوڕێکانم دەچن بۆ قوتابخانە. کاتێک دەمویست لە باوکم بپرسم من بۆ ناتوانم بچم بۆ قوتابخانە، ئەو پشتگوێی دەخستم و تەنها دەیگوت «کچان پێویستیان بە فێربوون نییە.»

چەند ڕۆژێک بەر لە ئێستا نەنکم هات بۆ ماڵمان تا لەگەڵمان بژی. هەر شەش مانگە و لەگەڵ یەکێک لە نەوەکانی دەمێنێتەوە. یەکەم ڕۆژ کە هات بۆ ماڵمان، داوای لێکردم دەفتەرەکانی قوتابخانەمی پیشانبدەم. دەستمی گرت و بردمی بۆ قوتابخانەکەم و کتێبەکانمی بۆ وەرگرتمەوە و لە قوتابخانە ناونووسی کردمەوە. کە گەڕاینەوە ماڵەوە، بە دایک و باوکمی گوت کە ئەگەر بێت و ڕێگرbن لە چونە قوتابخانەم، ئەوا هەرگیز لێیان خۆشنابێت. وا هەست دەکەم لە خەوندام. سبەی یەکەم ڕۆژی قوتابخانەمە دوای ساڵێک دابڕان. هەموو ئەمانەش بە هۆی نەنکمەوە بوو.

– پۆپی



نەنکم سواڵکەر بوو، سواڵی بۆ ئێمە دەکرد. دایکم بەسەر منەوە گیانی سپارد. هیچ یادگارییەکی ئەوم لا نییە. نەنکم من و چوار پورزای دیکەمی بە تەنها بەخێوکرد. پورم بەهۆی ئەشکەنجەکانی مێردەکەیەوە کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنا. دوای کۆچی دوایی هەر دوو کچەکەی، نەنکم لە پێناو ئێمەدا دەجەنگی. ئێستاش لە یادمە چۆن ئێواران درەنگ دوای خۆرئاوابوون، دەگەڕا و خواردنی بەرماوە و فڕێدراوی کۆدەکردەوە. لەبەردەم مزگەوت و بازاڕەکاندا سواڵی دەکرد. هەرچی هەبوو فرۆیشتنی لە پێناو پەیداکردنی بژێوی ئێمەدا، تەنانەت جانتاکەی باپیریشم، کە تەنها یادگارییان بوو کە مابوویەوە. ئێستا هەموو گەورە بووین و هەر یەکە و لە سوچێکدا خەریکی ژیانکردنین. بەڵام خۆشەویستیمان بۆ نەنکمان وەک خۆیەتی و نەگۆڕاوە. من و هەر چوار پورزاکەم، هەموو مانگێک پارەی بۆدەنێرین. قەنەفەمان بۆ کڕی و خانوەکەمان بۆ نوێکردەوە. ئەم ماوەیە تەندروستی باش نییە. ڕۆژێک لێم پرسی کە دوا ئاواتی چییە. ئەویش سوێندی لێوەرگرتین کە «هەرگیز هیچ مامەڵەیەکی ناشرین نەنوێنین بەرامبەر بە هەر سواڵکەرێک کە دێتە بەردەرگاکەمان و داوای خواردن دەکات. من تا ئێستاش نزا بۆ هەر کەسێک دەکەم خواردنی داوەپێم و یارمەتی داوم ئێوە گەورە بکەم. هیچ ئازارێک لە ئازاری برسیەتی گەورەتر نییە.»

- ئەسما



سالێک لەمەوپێش منداڵەکانم جێهێشت، یان بابڵێین ئەوان جێیان هێشتم. ئەو ڕۆژە منداڵەکانم پێکەوە شەڕیان دەکرد لەسەر ئەوەی گۆشەیەک لەماڵەکەی خۆیانم پێ بدەن بەنۆرە. بیانووی بچووکترین کوڕم ئەوەبوو کەمن زۆر قسە دەکەم و نەوەکانم وەڕەس دەکەم و کێشەیان بۆ درووست دەکەم لە کاتی وانە خوێندنیاندا. هێشتا لەبیرمە کەچۆن چەندین مانگم بەبێخەو بەسەربرد، کاتێک بچووکترین کوڕم پێش وادەی خۆی لەدایک بوو. لەنێو لۆکەو جلی نەرمدا دام دەناو هەرگیز نەمدەهێشت بۆ چرکەیەکیش لە نێو جلی تەڕدا بێت. ئەو کاتانە کە دەگریا، گۆرانییەکم بۆ دەگوت یان دێڕە شیعرێکم بۆ دەخوێندەوە، یەکسەر ژێردەبوەوە. هەرگیز بێزار نەدەبوو بەهۆی زۆر قسەکردنمەوە. لەوەزیاتر نەمویست بێزاربن، بۆیە گەڕامەوە بۆ گوندەکەی خۆم تا لەخانووە چۆڵەکەمدا بژیم. ئەوان زۆریان پێخۆش بوو، کەسیان لێیان نەپرسیم کەچۆن دەتوانم بەتەنیا بژیم; ئەی ئەگەر لەم کوخە وێرانەدا مردم و کەس پێی نەزانیم؟ کاتێ کە گەڕامەوە بە بەلەم، وەک منداڵێک دەگریام، دەمویست بموەستێنن. پاش ئەو گەشتە دوانزە کاتژمێرییەم، کەسێک نەبوو کەمێک خواردن یان بتلێک ئاوم بداتێ. کاتێک پیر دەبیت و هەرچی پاشەکەوتتە لە منداڵەکانتدا خەرجت کردووە، ئێتر لاواز دەبی. ئەم ماوەیە ناتوانم ڕێ بکەم، ئەم پێستە نەوەد ساڵەییەم هیچ شێی تێدا نەماوە. کەس دەست لەقاچەکانم نادات و بپرسێت کە چیم پێویستە. من لە ناوەوە و دەرەوەش تێکشکاوم.



- ناسیما، ٩٢ ساڵ

هەموو ڕۆژێک لە ناو زبڵدانەکاندا بۆ یاری منداڵان دەگەڕام. پێشتر هەرگیز
بوکەشوشەم نەبووە. چەند ڕۆژێک لەمەوبەر ئەمەم لەوێ دۆزییەوە.
جوان نییە؟...

- فاتمە



دایکم هەفتەیەک لەمەوبەر کۆچی دوای کرد. هیچ وێنەیەکی ئەوم نییە. زۆر جار ویسویەتی وێنە بگرێت، بەڵام بۆ وێنە گرتن پێویستی بە پارە بوو. ئەگەر هەفتەیەک لەمەوبەر بهاتیتایە، ئەوا دەمتوانی بتبەمەوە ماڵەوە بۆ لای دایکم. هەتاوەکو نانی نیوەڕۆت لەگەڵ نەخواردینایە نەیدەهێشت بڕۆیت. هەر کاتێک کەسێک سەردانی کردبێتین، هەمیشە بەشە خواردنەکەی خۆی پێداوە. دایکم بە تەنیا من و سێ پشیلەی ماڵیی هەبوو. هیچ کەسێک سەردانی نەدەکرد، چونکە نەخۆش بوو. هەموو ڕۆژێک کاتێک باوکم لەسەر کار دەگەڕایەوە، لێی دەپرسی کە بۆچی نامرێت. بەڵام من لە منداڵیەوە هەموو ڕۆژێک مەرگی ئەوم بینیوە. زڕ دایکێک و دوو زڕخوشکم هەبوو. بەڵام دایکم فێری کردبووم ئەوانم خۆشبوێت، ئەگەر چی ئەوەی ئەوان هەمیشە ڕقیان لە ئێمە بوو. ئەو ڕۆژەی دایکم کۆچی دوای کرد، نەگریام، دڵخۆش بووم. دڵخۆش بووم بە سەیرکردنی ڕووخساری دایکم کە بۆم پێدەکەنی. دایکم زۆر جار دەیگوت ئەگەر من بگریم ئەوا لە دڵیدا هەست بە ئازار دەکات، لەبەرئەوە ناتوانم بگریم. ناتوانم ڕێگە بدەم رۆحی دایکم بۆ یەک تۆزیش بێت ئازار بچێژێت.

- ئادۆر، ١٢ ساڵ



خۆشەویستەکەم جێی هێشتم چونکە دەیویست لەم گوندە دووری بخەمەوە، دەیویست بەتەنیا لەگەڵم هەڵبێت بۆ شار. بۆ دوو شەو دەبێت خەو لەچاوم نەکەوتووە. بەهەموو ژیانم ئەوەندە نەگریاوم. ئاسان نەبوو کاتێک پێم گوت، «نابێت». ئێمە هاوڕێی منداڵی بووین، ئەو نەبێت، هەرگیز قسەم لەگەڵ هیچ کچێکی دیکە نەکردووە. جاری وا هەبووە هەموو شەوەکە لە حەوشەی پشتەوەیان چاوەڕێی تاقە نیگایەکیم کردووە لە پەنجەرەکەوە. بەڵام ئێستا دەبێت پێی بڵێم نەخێر، چوون هەست ناکەم شتێکی باش بێت. دایکم بە بێ باوک بەخێوی کردووم، ئەوە بۆ ئەو ئاسان نەبوو. هەموو خۆشبەختی خۆی کردە قوربانی بۆ بەخێوکردنی من. چۆن دەتوانم ئەوەندە خۆپەرست بم بەجێی بهێڵم؟ بەم دواییانە، کە بتڵی ڕۆنی گوێزە هیندییەکەی هێنا و لە ژورسەرم داینا، وورد تەماشای پێستیم کرد چۆن تێکچووە. دایکم هەرگیز کوپێک شیریشی لەبەشی من دەستکاری نەکردووە. یەک دڵۆپە ڕۆنیشی لە بتڵەکەی من بەکارنەهێناوە. بۆ ئەو هەمیشە لەپێش هەموو شتێکەوەم. ئیتر چۆن دەتوانم بیر لە جێهێشتنی بکەمەوە؟ دوێنێ لێی پرسیم، «چی ڕویداوە؟» منیش بە زەردەخەنەیەکەوە پێم گوت، «هیچ ڕووی نەداوە.».

- ڕۆجوو، ١٩ ساڵ



دایکم سۆزانی بوو، من لە ماڵی سۆزانییەکان لەدایک بووم. هەرگیز دایکمم بە دڵخۆشی نەبینیوە، بەڵام هەر جارێک کە من سەیرم دەکرد، ئەو پێدەکەنی. هەموو لەو ماڵەدا دڵ تەنگ بوون، چونکە دایکم کوڕی هێنابووە دنیاوە.

دایکم جیاواز بوو، هەرگیز ڕێگەی پێنەدەدام لێی نزیک بمەوە، دەمویست لە باوەشیدا بخەوم، دەمویست ماچی بکەم بەڵام هەرگیز ڕێگەی پێنەدام دەستی لێبدەم. هەندێ کات دەمویست ڕقم لێی بێت. هەندێ ڕۆژ کە لە خەو هەڵدەستام، دەمبینی بە بڕینی دەست و قاچەکانی بە گوێزان، ئازاری خۆی دەدا. خوێنەکەیم دەسڕی و ڕوخساریم پاک دەکردەوە بەڵام ئەو هەرگیز نەدەگریا و هەمیشە بۆم پێدەکەنی. ڕۆژێک لێم پرسی باوکم لەکوێ دەژی؟ دایکم دەستی بۆ دڵی برد. هەوڵم دەدا پڕ بە دڵ رقم لێی بێت. هەموو ڕۆژێک، هەموان پێیان دەگوتم زۆڵ، تەنانەت لەو شوێنە هەژارنشینەش کە من و دایکم بۆ دەستپێکردنی ژیانێکی نوێ بۆی چوین دوای هەڵهاتنمان لە ماڵە سۆزانییەکە. هیچ کەسێک دەرفەتی کارکردنی بە دایکم نەدەدا، هیچ کەسێک قسەی لەگەڵ نەدەکردین. زۆر کات خەڵکی بەردیان دەگرتە سەربانی کوخە پلاستیکییەکەمان. ئەو ڕۆژەی دایکم کۆچی دوای کرد، ئەو زۆر هێمن بوو، بۆ یەکەمین جار ڕوومەتەکانمی ماچ کرد. پێی گوتم کە چەن سوپاسگوزارە چونکە من ئەوم وەکو دایکێک هەڵبژاردووە، چونکە خۆشەویستیەکم پێبەخشیووە کە هەرگیز لە ژیانیدا هەستی پێ نەکردبوو. دایکم بە تەنیا جێیهێشتم. ئەو ناتوانێت بێت بۆ لای من، بەڵام من دەتوانم بچم بۆ لای ئەو.



– شادین، ١٣ ساڵ

دایکم سۆزانی بوو، من لە ماڵی سۆزانییەکان لەدایک بووم. هەرگیز دایکمم بە دڵخۆشی نەبینیوە، بەڵام هەر جارێک کە من سەیرم دەکرد، ئەو پێدەکەنی. هەموو لەو ماڵەدا دڵ تەنگ بوون، چونکە دایکم کوڕی هێنابووە دنیاوە.

دایکم جیاواز بوو، هەرگیز ڕێگەی پێنەدەدام لێی نزیک بمەوە، دەمویست لە باوەشیدا بخەوم، دەمویست ماچی بکەم بەڵام هەرگیز ڕێگەی پێنەدام دەستی لێبدەم. هەندێ کات دەمویست ڕقم لێی بێت. هەندێ ڕۆژ کە لە خەو هەڵدەستام، دەمبینی بە بڕینی دەست و قاچەکانی بە گوێزان، ئازاری خۆی دەدا. خوێنەکەیم دەسڕی و ڕوخساریم پاک دەکردەوە بەڵام ئەو هەرگیز نەدەگریا و هەمیشە بۆم پێدەکەنی. ڕۆژێک لێم پرسی باوکم لەکوێ دەژی؟ دایکم دەستی بۆ دڵی برد. هەوڵم دەدا پڕ بە دڵ رقم لێی بێت. هەموو ڕۆژێک، هەموان پێیان دەگوتم زۆڵ، تەنانەت لەو شوێنە هەژارنشینەش کە من و دایکم بۆ دەستپێکردنی ژیانێکی نوێ بۆی چوین دوای هەڵهاتنمان لە ماڵە سۆزانییەکە. هیچ کەسێک دەرفەتی کارکردنی بە دایکم نەدەدا، هیچ کەسێک قسەی لەگەڵ نەدەکردین. زۆر کات خەڵکی بەردیان دەگرتە سەربانی کوخە پلاستیکییەکەمان. ئەو ڕۆژەی دایکم کۆچی دوای کرد، ئەو زۆر هێمن بوو، بۆ یەکەمین جار ڕوومەتەکانمی ماچ کرد. پێی گوتم کە چەن سوپاسگوزارە چونکە من ئەوم وەکو دایکێک هەڵبژاردووە، چونکە خۆشەویستیەکم پێبەخشیوە کە هەرگیز لە ژیانیدا هەستی پێ نەکردبوو. دایکم بە تەنیا جێیهێشتم. ئەو ناتوانێت بێت بۆ لای من، بەڵام من دەتوانم بچم بۆ لای ئەو.



تەمەنم سیانزە ساڵ بوو کاتێک هاوسەرگیریمان کرد. پێش هاوسەرگیری نەمبینیبوو. کاتێک یەکەم جار یەکمان بینی وەک دوو نامۆ دانیشتین و نەماندەزانی باسی چی بکەین. یەک وشەشمان نەگوت، تەنانەت لە ڕۆژی هاوسەرگیریەکەشماندا. هەرگیز بە بیرمدا نەدەهات کە ئەو پیاوەی لە تەنیشتم دانیشتووە، ڕۆژێک دەبێت بە گرنگترین کەسی ژیانم. چەند جار هەبووە خەسو و خەزورم زۆریان لێکردووە تا هاوسەرگیری بکاتەوە, چونکە پێنج ساڵ بەسەر هاوسەرگیریماندا تێپەڕی بوو و من منداڵم نەبوو بوو. ڕۆژێک بێ دوودڵی هەرچیم هەبوو کۆم کردەوە و ویستم لەژیانی بچمە دەرەوە، بەڵام ئەو گریا و لێم پاڕایەوە کە بەجێی نەهێڵم. هیچ ڕۆژێکی ژیانم نەبووە هێندەی ئەو ڕۆژە هەستم بە خۆشبەختی کردبێت. بۆ شەست ساڵ دەچێت پێکەوەین، بەتەنیا خۆمان دەژین بێ منداڵ. چەندین ڕۆژ هەبووە کە نەیتوانیوە بچێت و شتێک لە بازاڕ بهێنێتەوە. هەژاریی هەمیشە بەشێک بووە لە ژیانمان. هەردوکمان زۆرجار نەخۆش دەکەوین و هەست بە یەکتر دەکەین چۆن پیر دەبین و بەهێواشی بەرەو پیری مەرگ دەچین. بەڵام هەرگیز هەستمان بە تەنیایی نەکردووە و هەستمان نەکردووە کە ژیانمان ناتەواوە و پێویستمان بە منداڵێکە. لە وەرزە باراناوییەکاندا دەچێت بۆ ڕاوە ماسی و منیش چاوەڕوانی گەڕانەوەی دەکەم تا دەگەڕێتەوە. هەندێک جار پێم دەڵێت کە زۆر دەترسێت ئەو شەوانەی بە تەنها جێمدێڵێت و دەچێت بۆ ڕاوە ماسی. تەنانەت ئەمڕۆش هیچ خواردنمان نییە لە ماڵەوە، نازانم ئایا دەتوانێت هیچ خواردنمان بۆ بهێنێتەوە بۆ ئەمڕۆ یاخود نا. لە ئێستادا چێژ لە تیشکی خۆری زستان دەبینین و پێکەوە باسی ڕۆژە کۆنەکان دەکەین. دەزانین کە بەم نزیکانە یەکێکمان یان هەردوکمان کۆچی دوایی دەکەین و کەسیش نابێت بۆمان بگری.

- سالیحە



«من پارەم نییە بەرگی مەرگیشم بکڕم کەچی تۆ لێم دەپرسیت کە ئایا بەرگی زستانم هەیە؟
من جاهیدەم، نازانم دەمەوێت بچمە کوێ، بەڵام زۆرجار هەوڵم داوە بزانم، لەوانەیە وەک هەر ڕۆژێکی دی، ئێوارە بچمەوە بۆ ماڵەکەی خۆم. هەرگیز پێم وانەبووە لەم قۆناغەی ژیانمدا بەم ڕادەیە هەست بە تەنهایی بکەم. کەسێ نییە بمدوێنێت، کەسێک نیە گرنگیم پێ بدات و بپرسێت کە ڕۆژەکەم چۆن دەبەمە سەر. بەتێپەڕبوونی کات هەستم نەخۆشم دەخات، هەستی ئەوەی کە بەسەرچووم... زۆر بەئازارە کاتێ بەرێدا دەڕۆم، بەڵام دەمەوێت گەشتێک بکەم، گەشتێکی درێژ بە تەنها، بێ یارمەتی، بێ هەڵگرتنی هیچ شتێک. حەفتا ساڵی ژیانم بێ هەبوونی هیچ ئاواتێک بەسەربردووە، بەڵام ئێستا دەمەوێت بچمە جێگەیەک، نازانم کوێیە وا هێشتاش دەمەوێ بزانم.



زا دەکەم دایە جاهیدە بچێتە هەر جێیەک بە هەموو دڵیەوە بڕوات. بەهۆی گەشتە خرۆشاو و هەمیشەییەکانمەوە بۆم نەگونجا نامەی سوپاس گوزاری بۆ هەر یەکێک لەو تاکانە بنێرم کە شاڵی جوانیان بۆ دایکانی وەک دایە جاهیدە ناردووە. هاوڕێیانم، بە شکاندنی تەمی ئەم زستانە،تا ئێستا هەموومان پێکەوە ڕووناکیمان خستووەتە ژیانی نزیکەی سێسەد و پەنجا ڕۆحی بەساڵاچووەوە. ناتوانم بەتەواوی سووپاستان بکەم بۆ پێچانەوەی هەموو ئەو دیارییە پڕ خۆشەویستیانەتان، من بەختەوەرم کە پەیامبەری گرنگی پێدانەکانی ئێوەم. هێشتا ڕێگەیەکی زۆر دوورم لەپێشە و دەمەوێت بۆ هەر جێیەک کە دەڕۆم جێ پێی خۆشەویستی و میهرەبانی بەقوڵی بچێنم، کۆڵێک خۆشەویستی بۆ هەمووان.

*ئاکاش

کێشەی من ئەوەیە گێژم و ناتوانم درۆ بکەم، چەند ڕۆژێک لەمەوبەر سواڵکەرێک منی بە کرێ گرت بۆ ئەوەی وەک منداڵێکی کوێری ئەو ڕۆڵ ببینم. وامان دانابوو بە دەوری ترافیکی شاردا بسوڕێینەوە و سواڵی خواردن بکەین. بەڵێنی پێدابووم لە کۆتایی ڕۆژەکەدا ٥٠ تەکە و خواردنم پێبدات. منیش بە باشی پرۆڤەم کرد و ئەویش دڵنیا بوو لەوەی بە باشی ڕۆڵەکە دەبینم. پاشان دەستمان بە کارەکەمان کرد. بۆ ماوەی کاتژمێرێک کارەکە بە باشی دەڕۆشت. بەڵام کاتێک لە جامی ئۆتۆمبێلێک نزیک بوینەوە، کە ژن و منداڵێکی تێدا بوو، لە کاتێکدا ژنەکە پارەی پێدەدام، کوڕەکەیم بینی بە ئۆتۆمبێلێک یاری دەکرد. ژنەکە بەڕێز دیار بوو، بۆیە لە جیاتی وەرگرتنی پارەکە، وتم : «خاتوون، من منداڵێکی کوێرم، هیچ یاریەکی منداڵانەم نییە، تکایە دەتوانیت ئۆتۆمبێلە سورەکەی کوڕەکەتم بدەیتێ؟».دوای چەند خولەکێک، شۆفێری ئۆتۆمبێلەکە بە دوام کەوتبوو و منیش بە هەموو توانامەوە ڕام دەکرد و دایکە سواڵکەرە درۆینەکەشم لە دوای خۆم بەجێهێشت.



زۆر بە ڕونی ئەو ڕۆژەم لەیادە کە بۆ یەکەم جار ماتۆڕم لێخوڕی. یەکەم نەفەر کە لەگەڵم سەرکەوت، ئەو برە کرێیەی نەدا پێم کە داوام لێکرد. ئەوە یەکەم جارم بوو ماتۆڕ لێبخوڕم، هەر لەو کاتەشەوە، ڕقم لە هەموو نەفەرەکان هەڵگرت و دڵم پڕ بوو لە ڕق بەرامبەر دەوڵەمەندەکان. زۆر بڕوام بەوە هەبوو کە خەڵکی شار هەموو بێ دڵ و بێ هەستن. تا ڕۆژێک تەواوی ژیانم گۆڕا. کچێکی گەنج لەگەڵم سەرکەوت لە ناوەڕاستی بیستەکانی تەمەنیدا بوو. بەردەوام داوای لێدەکردم خێرا لێبخوڕم چونکە تاقیکردنەوەی هەبوو. لەو هاوینە گەرمەدا، لە شوێنێکی دوورە دەست، هەستم بە ئازارێکی زۆر کرد لە سنگمدا. کەوتمە سەر زەوییەکە. کچەکە هاواری دەکرد و داوای یارمەتی دەکرد، بەڵام من توانای قسەکردنم نەبوو. لە هۆش خۆم چووم و هیچی دیکەم بیرنایەت. بەڵام کاتێک هۆشم هاتەوە، بینیم لە نەخۆشخانەم. پزیشکەکە و پەرستارەکە پێیان گوتم کە کچێک منی بردووە بۆ نەخۆشخانە و پارەی هەموو چارەسەرەکانیشمی داوە. ناونیشانی گەراجێکیان داپێم لەو شوێنەی کە بورامەوە، تا بچم و ماتۆڕەکەم هەڵبگرمەوە. داوام لە پزیشکەکە کرد ئایا ڕەقەمی کچەکەی لایە. ئەویش زۆر سەرقاڵانە وەڵامی دامەوە کە کچەکە هیچ ناونیشان و ڕەقەمێکی دانەناوە. من بەتەنها لەسەر جێخەوی نەخۆشخانەکە دانیشتبووم، لە ناکاو دەستم بەر گیرفانم کەوت و هەزار تەکەم دۆزییەوە. لەوێدا دەستم کرد بە گریان. نازانم ئەگەر کچەکە لە تاقیکردنەوەکە دەرچوبێت یان نا، بەڵام تا مابم نزای بۆ دەکەم. ئەو لە تاقیکردنەوەی مرۆڤایەتیدا سەرکەوتوو بوو کە تەنها چەند کەسێکی کەم دەتوانن تێیدا سەرکەوتوبن.





من ناوم حوسەین شەفیەیە، شەفیە ناوی دایکمە، و لەگەڵ ئەویشدا دەژیم. هەرگیز باوکمم نەبینیووە چونکە ئەو هەرگیز نەیویستووە من یان ئێمە ببینێت. بە تەواوی نازانم ئەو لە کوێ دەژی و چی دەکات. هەموو ئەو شتانەی دەیزانم لە دایکمەوە فێریان بووم، دایکم فێری کردووم بەهێز بم. لە کاتێکدا کە بە منەوە دووگیان بووە، دەبووایە هەموو ڕۆژێک ١٠٠٠ بلۆک بگوازێتەوە لە پێناو دەستکەوتنی بژێوی ژیانی. ئەو ڕۆژەی ئەوەم بیست، لە دایکمم پرسی ئاخۆ چۆن توانیویەتی بە تەنیا ڕووبەڕووی هەموو ئەو ئاستەنگیانە ببێتەوە. پێکەنی و دڵنیای کردمەوە کە ئەوە هیچ بە ئازار نەبووە چونکە ئەو بە تەنیا نەبووە، لە کاتێکدا من لەناو منداڵدانی گەرم و ئارامیدا خەوتوم، یارمەتی ئەوم داوە. دایک و باوکی هەموو هاوڕێکانم دەیانەوێت منداڵەکانیان دەوڵەمەند و سەرکەوتوو بن لە ژیاندا، بەڵام دایکم شتێکی زۆر سادەی بۆ من دەوێت، دەیەوێت دڵخۆش بم. فێری کردووم هەمیشە پێبکەنم تەنانەت لە کاتێکیشدا کە دڵم پڕە لە گریان. بەهۆی تاکە مامۆستاکەمەوە فێر بووم بەسەر دڵخۆشیدا زاڵ بم، ئەو مامۆستایەش دایکمە، شەفیە بێگووم.

هەمیشە وا هەستم کردووە کە هەموو کەس لە من دڵخۆشترە. بۆ من، هەژاری یەکێک بوو لەو شتە قێزەونانەی کە مرۆڤێک دەکرێ هەیبێت. کاتێک وەک خزمەتکارێک لەماڵێکی کۆشک ئاسا کارم دەکرد. منداڵی ماڵەکە بە دادە بانگی دەکردم. لە کۆشکی خاوەنکارەکەم دەمویست دەربارەی دڵخۆشی و خۆشەویستی پاک شت فێر ببم، کە تەنها لە ڕێگەی پارەوە بەدەست دێت. لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا، زانیم.
کە منداڵە پێنج ساڵانەکە هەرگیز دەرفەتی ئەوەی نەبوو لە ئامێزی دایکیدا دابنیشێت، نە دایکەکە و نە باوکەکەش هیچ خەمێکیان بۆ کوڕە تاقانەکەیان نەدەخوارد. من دونیای ئەو بووم. ئەگەر تا‌ی هەبوایە، هەموو شەوەکە بەخەبەر دەبووم. شەوێک، کاتێک داوام لە خانم کرد تاوەکو کوڕەکەی لەگەڵ خۆیاندا بخەوێنێن، بۆی ڕوونکردمەوە کە چەنێک ناتەندرووستە منداڵ، لەگەڵ دایک و باوکیدا بخەوێت. وتیشی کە کەسانێکی هەژاری وەک من لە ژیانی تایبەتیی تێناگەن.
لەوانەیە ئەوە ڕاستیش بێت.گەر کوڕەکەم تا‌ی هەبێت، بەتەنیا جێی ناهێڵم، تەنها بۆ ئەوەی ژیانێکی تەندرووستی هەبێت. دەوڵەمەندی چەن سەیرە!



کوڕەکە سەرجەم یارییە منداڵانەکانی دونیای هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا، باوکێکی ملیۆنێری هەبوو کە مانگی یەک جار دەیتوانی بیبینێت. لەوە تێگەیشتم کە کوڕەکەم چەنێک دەوڵەمەندە. مێردەکەم ئەسپی کوڕەکەم بووە. کەسانی هەژار ناتوانن بەناوبانگترین یاری منداڵانەی بۆ دابین بکەن، تەنها دەتوانین پشتیان دابین بکەین.
خانم و مێردەکەی هەرگیز لەگەڵ یەکتردا نەدەدوان، ڕۆژێک ئەوەشم بۆ دەرکەوت کە هەردووکیان خۆشەویستی نهێنیان لە دەرەوە هەیە.
دەمویست منداڵەکە دڵخۆش بێت، پێبکەنێت. دەمویسیت بۆ دایکی بگری نەک بۆ من. دەمویست سوار کۆڵی باوکی ببێت وەک چۆن کوڕەکەی من دەیکرد. بەڵام نەخێر، ئەو نەیدەتوانی . دوای ٦ مانگ ئەو کارەم بەجێهێشت. نەمدەتوانی بچمەوە ئەو کۆشکە، ئێمە خوێن و ئارەقی خۆمان دەڕێژین بۆ بینینی زەردەخەنەی منداڵەکەمان. ڕێگەی پێ دەدەین لە نێوانماندا بخەوێت، بەبێ گوێدانە ئەوەی منداڵەکە خۆشەویستیمان لێ دوور بخاتەوە. ئەمە ئەوەیە کە پێی دەگوترێت دەوڵەمەندیی هەژاران ...

گوندنشینەکان خۆیان بڕیاریان لەسەر هاوسەرگیرییەکەم دا. ئاهەنگەکە زۆر تایبەت نەبوو، بەڵام وەک کچێکی هەتیو سوپاسگوزار بووم. کەسێک کراسێکی پیاوانەی بەکارهێنراوی بە مێردەکەم دابوو. کونێکی گەورە بە لای ڕاستی کراسەکەوە بوو. بە درێژایی ئاهەنگەکە بە دەستێکی ئەو کونەی دەشاردەوە. مێردەکەشم ، جگە لە پورێک، هیچ کەسێکی دیکەی نەبوو. هەروەها ڕێگەی پێداین شەوی هاوسەرگیریەکە لە ماڵەکەی ئەودا بمێنینەوە. ئەو شەوە کە مێردەکەم هاتە ژوورەوە، بە بێ دوو دڵی پێم گوت، «کراسەکەت دابکەنە.» بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوو. هێشتا پێکەنینم بە خۆم دێت کاتێک بیر لەو شەوە دەکەمەوە. خاولیەکەی دەرهێنا و لەشی پێ داپۆشی. لە کاتێکدا سەرقاڵی دوورینەوەی کونەکانی جلەکەی بووم، ئەو لەسەر زەوییە قوڕەکە خەوی لێکەوت. لەو شەوەوە تێگەیشتم کە ئەم پیاوە هەرگیز بەجێم ناهێڵێت.



من حەز بە خواردنی شیرینی دەکەم بەڵام نرخیان گرانە، ئیدی هەندێ کات مێردەکەم بە نهێنی باتاسا (جۆرێک شیرینی بەنگلادیشە)م بۆ دەهێنێتەوە. ئێستا کچەزا و کوڕەزام هەیە، زۆرم لێدەکات هەمووی بخۆم بێ بیرکردنەوە لە دابەش کردنی لەگەڵ ئەوانی تردا. هێشتا بە بوکەخان بانگم دەکات سەرەڕای ئەوەی کوڕە بچوکەکەم تازە هاوسەرگیری کردووە. هەر کاتێک دەگەڕێتەوە ماڵەوە، بە بوکەخان بانگی من دەکات، بەڵام بوکەکەم بەرەو لای ڕا دەکات و ئەویش بە سەرسامییەوە دەڵێت کە مەبەستی من بووە نەک ئەو. خەڵکی گاڵتەی پێدەکەن بەڵام ئەوان نازانن کە ئەم شتە بچوکانە چەند بۆ من گرنگن. چەند ڕۆژێک لەمەوبەر، منی بردە شوێنێکی تازە کە کاتژمێرێک بە پێ دوور بوو. تاوەکو پێشانگایەکی کارەباییم پیشان بدات، کە پڕ بوو لە تەلەفیزیۆن. ئەو وەکو منداڵێک، لە بینینەوەی هەمان ڕووخسار لە گشت تەلەفیزیۆنەکان، چێژی دەبینی، کە لە هەمان کاتدا پیشانیان دەدایەوە. لێم پرسی بۆچی ئەم ئێوارەیەی لێرە بەسەر برد لە کاتێکدا تەنیا وێنەکان دەبینێت و ناتوانێ گوێی لە دەنگیان بێت. گوتی، «وێناکردنی وشەکان بەهرەی دەوێت».

ئێستا من پارە کۆ دەکەمەوە بۆ ئەوەی تەلەفیزیۆنێک بکڕم، تاوەکو چیتر مێردەکەم لەسەر ڕێگاکان نەوەستێت و وێنای ئەو وشانە بکات کە ئەو ڕووخسارانە دەیڵێن.



سەیری خێزانەکەم بکە. لەژێر پردەکە یەکمان دۆزییەوە. لەو ڕۆژەوە، پێکەوە دەخەوین، پێکەوە کاردەکەین و پێکیشەوە دەرباز دەبین. پارەم کۆکردۆتەوە تا بەتانییەک بۆ پڵنگەکەم بکڕم. لە ئێستادا زۆر ساردە، نامەوێت ئەویش وەک خۆم شەو لە تادا بتلێتەوە. نازانم هەستی لەماڵی خۆتدا بوون چۆنە، بەڵام کاتێک کە سەگەکەمم لەگەڵدایە وا هەست دەکەم لەماڵی خۆمدام.

– ڕاسێل، ١١ ساڵان

لیسا ١٠ خولەک لە من گەورەترە. هەرچەندە من لەو بچوکترم، بەڵام بەر لە کردنی هەر کارێک پرس بە من دەکات. بە تەنها ناتوانێت هیچ شتێک بکات. تەنانەت کاتێکیش کە شتێکی شیرین دەخوات لێم دەپرسێ ئاخۆ بۆ منیش تامی شیرینە. ئەگەر بڵێم بەڵێ، ئیدی باوەڕ دەکات کە لە ڕاستییدا شیرینە. هەندێ کات شەڕ دەکەین و قسە لەگەڵ یەکتر ناکەین. لەو کاتانەدا، دایک و باوکمان پەیوەندییەکەمان تاقی دەکەنەوە و داوامان لێدەکەن دوور لە یەک بخەوین. زۆرینەی کات دەچمە لای داپیرەم دەخەوم چونکە نامەوێت لیسا وا هەست بکات کە ناتوانم لە ئەو دوور بم. بەڵام لە نیوەی شەودا، بە خۆی و سەرینەکەیەوە دێت بۆ لام و لە تەنیشتمەوە دەخەوێت. وەک هەموو جارێک، دەستبازی لەگەڵ دەکەم بەبێ بیرکردنەوە لەوەی لەو ڕۆژەدا شەڕێکی زۆرمان کردووە.

– مونا، ٨ساڵ



هەموو کات ژیانم جیاواز بووە. چەندین شەوی سارد هەبووە کە باوەژنەکەم بە هێشتنەوەم لەدەرەوەی ماڵەوە سزای داوم. هەموو شەوەکان لەدەرەوەی دەرگەکەیان چاوەڕێم دەکرد و دەگریام. دەرگەکەشیان، وەک دڵیان هەمیشە داخراوبوو. پاش بەشوودانم پێیان گوتم کە چیتر سەردانیان نەکەم. ناتوانیت شەڕی بەدەستهێنانی خۆشەویستی بکەیت، دەبێت خۆی بێت بۆ لات.

لەکاتی لەدایکبوونمدا دایکم لەدەست دا. فێربووم چۆن بەسەختی دەربازم ببێت لەکاتێکدا بەدبەختترین کەسی دونیا ئەو کەسەیە ساتی لەدایکبوونی دایکی لەدەست بدات. من لەوەشدا بەدبەخت بووم کە هەرگیز نەمزانی چۆن هەستێکە خۆشبویستریێت. کاتێکیش هاوسەرەکەم دەرگەکەی لەسەرداخستم، هیچ سەرسام نەبووم. ئەوڕۆژەی هاوسەرەکەم فڕێی دامە دەرەوە، نەمزانی چیم بەسەردێت. نەمدەزانی ژیانێکی تر لەناوەوەمدا گەشە دەکات. بەسەرسامییەوە، کە لەسەر شەقام دەژییام خۆشبەختتربووم. کە لەماڵی باوکم بووم شەوان بە برسێتی سەرم دەنایەوە، هەروەها زۆرێک لەوشەوانەشی کە لەماڵی مێردەکەم بووم، بەڵام هەرگیز ڕۆژێک بە برسێتی لە شەقام سەرم نەناوەتەوە. چونکە هەمووکات کەسێک هەبووە خواردنی خۆیم لەگەڵ بەش بکات. هەستم بە تەنهایی نەدەکرد لەنێوان ئەو بێگانانەدا بەڵام زۆر هەستم بەتەنیایی دەکرد لەنێو خێزانەکەی خۆمدا.

کە کوڕەکەم نزیکی لەدایک بوون بووەوە ترسی مەرگم لێنیشت. بەڵام هەردووکمان ڕزگارمان بوو. هەرگیز لە سی ساڵی ژیانمدا هەستم بەو شادییە نەکردبوو. جگە لەخۆم کەس گرنگی پێ نەدەدا. بەڵام پێکەوە خۆشبەختیمان لە شکستماندا دۆزییەوە.

چەند ڕۆژێک لەمەوپێش کاتێک کوڕەکەم هێنا بۆ ئەم نەخۆشخانەیە، دکتۆرەکە پێی وتم کە هەموو هەوڵێکی خۆی دەدات تا کوڕەکەم ڕزگار بکات، بەڵام دەبێت بۆ خراپترین خۆم ئامادە بکەم و بەهێز بم. لەو ساتەدا ڕەتم کردەوە بەهێزبم، ڕەتم کردەوە کە واز لە ژیانم بهێنم. هەموو شەوەکەم لەسەر ئەژنۆکانم بەسەر برد. بەهەموو ئەو ووشانەی دەمزانی لە خوا دەپاڕامەوە. تا کەی خوا ئەم هەموو قورسییە دەخاتە سەر سنگم؟ کەی لەوە تێدەگات بۆ من چەندە سەختە؟ نازانم ئەو



شەوەم چۆن لێ ڕۆشت. پاش خۆرهەڵاتن پەرستارێک هات و پێی وتم کە دەتوانم سەردانی کوڕەکەم بکەم. خێرا ڕۆشتم. و زانیم کە خودا وەڵامی نزاکانی داومەتەوە.

– مایيده

شەرمکردن لە پێستی تاریکم هەر لەمنداڵییەوە بەشێک بووە لە ژیانم. کاتێک لەدایکبووم، هەمووان وەک شوورەیی بێت سەیری دایکمیان دەکرد بەوەی کە کچێکی پێست تاریکی بووە. لەو کۆمەڵگەیەی ئێمە لێی دەژیاین بە کەم سەیری پێستی تاریکیان دەکرد. کەس ئەوەی لەبەرچاو نەدەگرت کە من تەنیا کچێکی بچووک بووم و پێستی تاریکم دەکرا کاریگەری زۆری لەسەرم هەبێت. باوکم و دایک و باوکی ڕقیان لێم بوو چونکە من کچ بووم، یان با بڵێم کچێکی پێست تاریک بووم. بەردەوام سەرزەنشتی دایکمیان دەکرد بەوەی کە دەیانگووت ڕێک لەخۆی دەچم و هەرگیزیش ناتوانم هاوسەرێکی باش بدۆزمەوە. پاش چەشتنی ئەو هەموو ئازارە دەروونی و جەستەییانە، ڕۆژێک دایکم خۆی کووشت. ئەو کات تەنیا منداڵێکی بچوک بووم، بەڵام هێشتا ئەو ڕۆژانە لەم ڕۆژانەشم ناڕەحەتتربوون. نازانم چۆن گەشتمە ئەم سۆزانیخانەیە، هەموو ئەوەی دەیزانم ئەوەیە کە ئەگەر کچێکی کاڵ بوومایە یان کوڕ بوومایە ژیانم وەک ئێستا نەدەبوو، لەوانەیە دایکم زیندووبا یان شتەکان زۆر جیاوازتربان. ئەم ماوەیە بە شێوازی خۆم دەجووڵێمەوە؛ پێویست ناکات خەمی ڕەنگی جەستەم یان شێوازەکەیم بێت، خەڵکی تەنانەت ستایشی جەستە ڕەنگ گوێزییەکەم دەکەن بەوەی کە پێکەنینێکیان بۆ دەکەم. باشترە لە کۆمەڵگەیەک دوور بیت کە ڕەنگی پێستیان لە منداڵێکی بێسەرپەرشت پێ گرنگترە.

- ڕۆجینا



دایکم هەرگیز نەیتوانیوە جلی نوێمان بۆ بکڕێت. هەمیشە نزام دەکرد تا گەورە نەبم چونکە دەبوو هەموو کات هەمان جل لەبەربکەمەوە. دەترسام گەورەتر ببم و ئەو تەنیا جلەی هەمبوو بۆ بەرم نەبێت. لە ڕۆژە باراناوییەکاندا، دڵۆپە بارانەکان لە ڕێگەی سەقفە پلاستیکیەکەوە دەهاتنە نێو کوخە وێرانەکەمانەوە. لەنێو هەموو ئەو کابوسانەی ژیاندا، چیرۆکەکانی شەوانی دایکم تاکە دەرمانمان بوو. بە هەموو ژیانی تاکە چیرۆکێکی دەگوتەوە.
لەژیانمدا هیچ جێگەیەک بۆ خۆشەویستی نەبووە. تەنیا ویستومە کە دایکم لە سەتڵی خۆڵی سەرشەقامەکاندا بەشوێن پارچەدا نەگەڕێت تا بلوزێک بۆ خۆی درووست بکات. دەمویست مێنیوی خواردنمان لە برنج و خوێوە بگۆڕم چونکە خوشکەکانم حەزیان لێی نەبوو. پێش ئەوەی بێمە شار خوشکەکانم دەیانویست بزانن کە ئایا لە خانوە بەرزەکان و سەیارە گەورەکان دەترسم. نا، بەهیچ شێوەیەک نەترسام. نەترسام لەوەی کە گوندەکەم و خەڵکەکە و هەستە کۆنەکانیشم لەدوای خۆم بە جێبهێڵم.
پاش هاتنم بۆ شار لە کارگەیەکی چنیندا دەستم بە کار کرد. هەموو ڕۆژێک کاتژمێرێک بەپێ دەڕۆیشتم تا دوو کرێ پاس بگێڕمەوە. هەرگیز نانی نیوەڕۆم لەسەر کار نەخواردووە، چونکە پارە کۆکردنەوە بۆ من لەپێش هەموو شتێکەوە بوو. هاتم بۆ ئێرە تا خەونەکەم بپارێزم. بەم جۆرە توانیم خانویەک لە گوندەکە بۆ خۆمان بکرم و دوکانێکی بەقاڵی بۆ دایکم بکەمەوە و خوشکەکانم بنێرم بۆ قوتابخانە. خەون و جەنگی من هێشتا کۆتای پێ نەهاتووە. بیرۆکەی شازادەکەی منداڵی نێو دڵم لەخۆمدا کوشت، چونکە ئەوەم بینی کە چۆن باوکم بەهۆی ئافرەتێکی دیکەوە ئێمەی بەجێهێشت. عەشق فەنتازیای ملیاردێرەکان و تراژیدیای هەژارەکانە. من ئازاری برسێتی دەزانم، بۆ من ژیان لە عەشق گەورەترە.

- هەسنا





پێنازانی کاتێک پیر دەبی. ڕۆژێک تێبینی تاڵە ڕەساسییەکانی پرچت دەکەیت و چەند لۆچێکیش لەملاولای ڕووخسارت دەبینی. باوەڕ ناکەیت کە خەریکیت شتێک لە دەست دەدەیت، شتێکی زۆر بە نرخ. لە ڕاستیدا ساڵانی سەرەتا تەنیا بەم شتانە پێ دەکەنیت. هەتا ڕۆژێک، لە ژینی ئاسایی ڕۆژانەت خەبەرت دەبێتەوە و کەسە نزیکەکانی خۆت وات لێ دەکەن بزانیت کە سەردەمی مەرگی تۆش وا دەگات. لە دڵی خۆشەویستانتدا زۆر خراپ لەناو دەچیت. پێکەنینە بێ ددانەکانت چیدی خۆشەویست نابن، لەلایەن ئازیزترین و نزیکترین کەستەوە جێدەهێڵدرێیت.

هاوسەرەکەم بیست ساڵ لەخۆم گەورەتر بوو. هەرگیز نەیدەویست منداڵی خۆم هەبێت، من ئەمەم بەخۆشەویستییەوە پەسەند کرد. منداڵەکانمانم گەورەکرد و پاشانیش نەوەکانمان. تەنانەت پاش مەرگی هاوسەرەکەشم داوای بەشی خۆمم نەکرد، پێم وابوو منداڵەکانم دەبنە گەورەترین بەشی من. هەموو جۆرە قوربانییەکی بچووک و گەورەم دەدا و هیوا خوازبووم منداڵەکانیشم هەمان شتم بۆ بکەنەوە.

بەڵام ئەوان بەم دواییانە منیان گواستۆتەوە بۆ بەشە کراوەکەی ناندێنەکەیان. ئیدی بەباشی نابیستم . ئەم ماوەیە سارد بووە، لەسەرماندا دەلەرزم، لەتادا دەتلێمەوە و لەئازاردا دەگریم، کەس کاتی نییە گوێم لێ بگرێت. دڵنەوایی خۆم دەکەم بەوەی کە ئەمانە هەڵەی خۆم بوون. شەوانە نزا لای خودا دەکەم کە ئاواتی مەرگی هەموو ئەو پیرانە بێنێتە دی کە ڕووبەڕووی سووکایەتی وا دەبنەوە. لە ئێستادا گشت شەوێک تەنیا ئاواتی مەرگ دەخوازم.

– مێهروونێسا، ٨٣ ساڵ

پێویست ناکات ناوەکانمان بزانن، چوون ئێمە بە(مانگۆ دزەکان) بەناوبانگین. هەرچیەک بکەین، پێکەوە دەیکەین. ئەگەر یەکێکمان سزا بدرێین، ئەو سیانەی دیش وەک زنجیرە دەچینە پاڵی، لەبەرئەوەی لە هاوڕێیەتیدا دەبێت هەموو شتەکان بە یەکسانی بێت. لە هاوینی پێشوودا مامۆستای بیرکاریمان نەخۆش کەوت، کچەکەی ویستی تورشەمەنی بۆ درووست بکات، بۆیە داوای لە ئێمە کرد کە هەندێک مانگۆی لە گوند بۆ بهێنین. ئێمەش چووین بۆ لای (ڕامزان)، خاوەنی گەورەترین باخی مانگۆیە لەگوندەکەماندا کە خۆشترین مانگۆکان لەوێ گەشە دەکەن. کە گوێی لە داواکەمان بوو دەستبەجێ شووڵەکەی هێنا تا لێمان بدات، وە دووپاتیشی کردەوە کە مانگۆکانی ئەو هەمیشە بۆ فرۆشتنن و هیچ گوندنیشینێکیش ناتوانێت مانگۆیەکی بە خۆڕایی دەست بکەوێت. ویستمان وانەیەکی باشی دابدەین. ئەو شەوە پێکەوە لەگەڵ دە هاوپۆلی ترماندا چووین و هەرچی مانگۆ بە دارەکانەوە بوو لێمان کردەوە. بۆ ڕۆژی داهاتوو چوو بۆ لای مامۆستاکەمان و دەستی کرد بەگریان و باسی زیانەکەی خۆی بۆ کرد. مامۆستاکەمان لەبەردەمی ئەودا سزای داین و داوای لێکردین کە مانگۆکانی بۆ بگێڕینەوە. ئێمەش گەڕاندمانەوە بەو مەرجەی مانگۆیەک بدات بەهەریەکێک لە ماڵەکانی گوندەکە. دەزانین دزیکردن خراپە، بەڵام ئەو هاوینە هەموو گوندنیشینەکان میوەکانیان لەگەڵ یەکدی بەشکرد، کە ئەمە هەرگیز پێشتر ڕووی نەدابوو ...



- ڕانا
ڕۆتۆن
سۆجۆل
جوێل

بەتەنیا گەورە بووم. هەموو منداڵیم لە خانەی بێسەرپەرشتاندا بەسەر برد. ژیانم ئاسان نەبووە و هەمووکات بۆ خۆشەویستی بەپەرۆشبوومە. لە تەنیایی ڕزگارم بوو و ژیانم لەگەڵ هاوسەرەکەم دەستپێکرد. کە سەرەتا یەکمان بینی، شتەکان بەم جۆرەی ئێستا نەبوون. بەقوڵی یەکتریمان خۆشدەویست. ڕاستە هەموو ڕۆژێکمان پڕ تیشکی خۆر نەبوون، بەڵام بەخۆشەویستییەوە ڕووبەڕووی زریانەکان دەبووینەوە. ساڵێک لەمەوبەر زانیم کە هاوسەرەکەم پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ کەسێکی تردا هەیە. کاتێک زانیم شتەکان زۆر درەنگ بووبوون. بەردەوام درۆی لەگەڵ دەکردم و منیش دەمزانی درۆ دەکات، بەڵام نەمدەتوانی پێی بڵێم کە بەڕونی دەیخوێنمەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لێم دوور دەکەوتەوە، منیش لاوازانە تەماشام دەکرد. هەرگیز نەمویست دەربارەی ژیانە دەرەکییەکەی بزانم. نەمدەتوانی ڕقم لێی بێت و نەشمدەتوانی لێی گەڕێم بڕوات. هەوڵم دا بزانم چ هەڵەیەکم کردووە، هەوڵم دا ئەو خۆشەویستییەی لەدەستی داوە بۆی بگێڕمەوە. بەردەوام لەخۆمم دەپرسی کە دەبێت هەڵەم چی بێت، هەوڵم دەدا بزانم کەی لە پەروەردەکردنی عەشقمان وەستاین. بەهەموو خۆشەویستییەکمەوە لەتەنیشتی بووم و ئەو کوێر بوو. گەر بمویستایە دەمتوانی زۆری لێ بکەم، دەمتوانی سووکایەتی پێ بکەم، دمتوانی هەموو ئەوە هەڵوەشێنمەوە کە بنیادمان نابوو. بەڵام نەمدەویست لەدەستی بدەم، بەهەموو ژینمەوە خۆشمدەویست و دەمویست بەخۆشەویستییەوە لەگەڵم بژی نەک بە خیانەت کردن. ئەو ڕۆژەی ماڵەکەی جێهێشت زانیم ئیتر بۆ هەمیشە دەڕوات بۆیە بە دزییەوە پارەم کردە نێو جانتا بەتاڵەکەی. دەمویست دەستەکانی بگرم و داوای لێ بووردنی لێ بکەم گەر ڕۆشتنەکەی بەهۆی هەڵەی منەوەیە، بەڵام نەمتوانی. ساڵێک دەبێت ڕۆشتووە، لەگەڵ کوڕەکەم لەهەمان خانوودا دەژین. زۆر سەیرە تا ئێستاش من هەر ڕقم لێی نابێتەوە. ڕاستییەکەی، چەند بەشێکم زۆر بەخراپی دەیەوێت بگەڕێتەوە. دەمەوێت بێتەوە و بڵێت کە چەن خراپ بیری کردوین. ئەوە ڕووی نەداو لەوانەشە هەرگیز ڕوو نەدات، چونکە کە خۆشەویستی مرد زۆر خراپ دەمرێت.

– مەحموود



ئەو کاتەی لە پۆلی سێ بووم، هیچم دەربارەی شێرپەنجە نەدەزانی. هیچ کەس ڕێگەی پێنەدەدرا نزیکی دایکم ببێتەوە. هەمووان دڵنیا بوون لەوەی کەدایکم ڕۆژێک لە ساتێکدا کۆچ دەکات. لەبەرئەوە باوکم دایکێکی نوێی بۆ هێناین تا ئاگادارمان بێت. ئەو ڕۆژە دایکم وشەیەکیشی نەگوت. خوشکەکەشم زۆر گریا. شەوێک زۆر بەناڕەحەتی هەناسەی بۆ دەدرا. هێشتاش داوای لێ کردین لە تەنیشتی دابنیشین، پێی گوتین هەرچی ڕوو بدات دەبێت ئەم سێ خوشکەمان لەپشتی یەک بین. پاش ئەو هەموو ساڵە ماچێکی ڕومەتەکانی کردم و دە تاکای پێدام تا بتوانم شتێکی پێ بخۆم. پاش کەمێک بۆ هەمیشە چاوی داخست. نامەوێت هیچ دەربارەی دایکە نوێیەکەم بڵێم. باوکم دەستگێڕێکی لادێیە. سەرەڕای هەموو ناڕەحەتییەکان، من بەردەوام بووم لەسەر خوێندنەکەم. چەندین کات هەبووە نە قەڵەم نە وەرەقەم پێبووە، نە نانیش هەبووە بیخۆم. دەبوو ئەو دە تاکایەی بۆ خەرج بکەم، بەڵام نەمدەتوانی. ئەوە تاکە یادگاری دایکمە لام ماوە. چەند ڕۆژێک لەمەوپێش باوکم توشی ڕوداوێک بوو، بەهۆیەوە بۆماوەیەکی زۆر ناتوانێت کاربکات. دەمزانی هیچ ڕێگەیەک نییە تا تاقیکردنەوەکە ئەنجام بدەم بەڵام هێشتاش تاقیکردنەوەکە دەکەم. خوشکە گەورەکەم زۆری خۆشدەوێم بۆیە هەمیشە دڵنەوایم دەکات و دەڵێت «ڕوحی دایکمان هەموو کات لەگەڵمان دەبێت». بەو ڕوحە ڕێگەیەک دەدۆزمەوە. نازانم دایکم بۆ کوێ ڕۆشتووە و ناشزانم ئاگادارە بە هەموو ئەو ئازارانەی ئێستا هەمن، بەڵام بڕوام بەوە هەیە کە ئێستا نزاکانیم بۆ دەنێرێت.

– ئەختەر، ١٥ ساڵ



له منداڵیەوه هەموو کەسێک دەیگوت کە من کچم و توانای ئەو شتانەم نییە کە پیاو دەیکات. لەوەش زیاتر، بە ڕاستی باوەڕم هێنابووکە من گەمژە و بێ توانام. ڕەنگە لەو ڕۆژەی فێری ڕۆشتن بووم، هەستم بە ترس کردبێ لە کردنی هەر شتێک کە بە بێ دەست تێوەردانی باوکم یاخود بەبێ یارمەتی براکەم بووبێت. ئێمە لەسەر دورگەیەک دەژین، ژیانی کچ لەم شوێنەدا هەمیشە قورس بووە. بە شێوەیەک باوەڕم کردبوو کە هەرگیز ناتوانم کارێکی ئازایانە بکەم. هەتا ڕۆژێک، کاتێک هەموو پیاوەکان چووبوون بۆ ڕاوە ماسی، لافاوێک وروژمی هێنا و خانووەکەی ئێمە و دراوسێکانیش بە بارانی شەوێک کەوتنە ژێر ئاو. لەو شەوە باراناوییەدا هەموو خەڵکەکە بەرەو بەنداوەکە دەچون. داری مانگۆ›کەمان کەوتە خوارەوە و ٤ ژنمان بریندار بوون. من تاکە کچی گەنج بووم کە بە ڕاستی یارمەتیم دان. ئەو شەوە فێری کردم کە منیش وەک پیاوان توانام هەیە. هەر چواریانم دانە بە دانە پەڕاندەوە بۆ خانووە پارێزراوەکە، دوای ئەوە سێ کچی ترم لەگەڵ خۆم برد و پێکەوە دە ژنی بەتەمەنمان ڕزگار کرد و یارمەتی چەندین منداڵماندا و بە سەلامەتی گەڕاندمانەوە بۆ لای دایک و باوکیان. ئێمە هەموومان کچ بوین، بەڵام هەموو بڕوا و متمانەیان بە من هەبوو کە دەتوانم ڕزگاریان بکەم. ئەم بڕوا و متمانەیە، هێزێکی گەورەی پێبەخشیم. خۆشم تێناگەم بە چ شێوەیەک بووم بەو کەسەی کە هەرگیز نەمدەزانی منم. ماوەی ٥ ڕۆژ چێشتخانەیەکی ئاساییمان بەڕێوە دەبرد و چێشتمان بۆ گەورەکان و ژن و منداڵەکان لێدەنا. هەموو ڕۆژێک منداڵەکان و هەرزەکارەکانم دەژمارد، تا هیچ چەتە و بازرگانێک نەتوانێت کچەکانمان بفرێنێت. چونکە پێشتر کاتی لافاو، ئەوە گەورەترین کێشەمان بوو. کاتێک کە ئاوەکە دابەزی و گەڕامەوە ماڵەوە، کەسێکی جیاواز بووم، خەڵکی بە شێوەیەکی جیاواز سەیریان دەکردم. خۆشم بە شێوەیەکی جیاواز سەیری خۆم دەکرد. هێز هەموو جیاوازیەکان دروست دەکات.



– سورەییای حەڤدەساڵ

هاوسەرەکەم هەرگیز نەیدەهێشت ڕەنگی سپی بپۆشم. ڕەنگی دڵخوازی ئەو پرتەقاڵی بوو. منیش حەزم بەو ڕەنگە نەدەکرد. هەموو کات بە خراپی مامەڵەم لەگەڵ دەکرد. ڕۆژێکیان کەوایەکی پرتەقاڵی بۆ هێنامەوە. ئەو ڕۆژە هیچ خواردنمان نەبوو بیخۆین بۆیە کەواکەم لەدەستی سەند و خستمە سەر ئاگرەکە. نەمزانی کە کەواکەی بەو پارەیە کڕیوە کە وەک بەخشش پاش ئەنجامدانی چالاکیەک وەریگرتووە. هەرگیز بایەخم بە هیچ شتێکی نەدەدا و هەرگیزیش پشتگیریم نەدەکرد. هاوسەرەکەم حەزی بە گۆرانی ووتن بوو، هەر خۆشی فێر بوو بوو چۆن کەمانچە بژەنێت. من ڕۆژەکانم لە هەژاری و برسێتی و لاوازیدا بەسەردەبرد. ئەویش هەمیشە دڵی خۆش بوو و گۆرانی دەگوت. منداڵەکانیشم شێتانە باوکیان خۆشدەویست. هەندێکجار گۆرانی بۆ دەگوتم منیش ڕووی تووڕەی خۆمم نیشان دەدا. پێم وابوو کە پیاوەکەم بەدرێژایی ژیانم ئەوەم بۆ دەکا بۆیە پێویست ناکات گرنگی پێ بدەم . دوای ئەوە هەرگیز پاش بەشداریکردن لەهەر بۆنەیەکدا فلسێکیشی نەدەهێنایەوە ماڵەوە. ڕۆژێکیان لە کاتی نانخواردندا پرسیاری پارەم لێکرد، گوتی کە ئەو بۆ حەز و بڕوای خۆی گۆرانی دەڵێت نەک بۆ پارە. دەستبەجێ قاپەکەم لەبەردەمیدا لابرد و فڕێمدایە دەرەوە. هەمووکات بەوجۆرە تووڕەبووم. بەڵام ئەو هەرگیز لێم تووڕەنەدەبوو، هەرگیز بۆڵەی نەدەکرد و هەرگیزیش ماندوو نەدەبوو. شەوێک نەگەڕایەوە، بەلەمەکەیان تووشی ڕووداوێک بوو بوو. ئەو شەوە هەموان ڕزگاریان بوو ئەو نەبێت. تەرمەکەیشی نەدۆزرایەوە. تا ئێستاش من هەر کەوای سپی لەبەر ناکەم، هەمووشەوێک کەمانچەکەی دەردەهێنم و لەو جێگەیە دایدەنێم کە لێی دەخەوت. هەندێک برنجی گەرمم ئامادە کردووە بەوهیوایەی کەسێک بدات لەدەرگەکەم و داوام لێ بکات بیکەمەوە، بەڵێنم پێ بدات کە چیتر دوا ناکەوێت و پێم بڵێت کە بەهەرنرخێکبێت هەرگیز جێمان ناهێڵێت.



٨ کاتژمێر لەمەوبەر، ئەم کچە بچوکەم بوو. تاکە مامانی ئەم دوورگەیە، بە چەند ڕۆژێک لە گوندەکەی ئێمەوە دوور بوو. مێردەکەم بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک لەبەردەمماڵیاندا چاوەڕێی کرد بوو. کەش و هەوا باش نەبوو، لەبەرئەوە داوای بەلەمێکی لە دراوسێکەمان کردبوو نەوەکو پێویستم بە نەخۆشخانەی فریاکەوتن بێت. مێردەکەم لە ڕۆژەوە لە ترسا دەژیا کە چومە بەشی منداڵبوون بۆ وەرگرتنی کوتان. لە هەمان ڕۆژدا چوومە پشکنینێک کە بە خۆڕایی بوو. دوای ئەوەی زانیم منداڵەکەم سوارە، وتم ڕەنگە پێویستم بە نەشتەرگەری بێت. مێردەکەم دڵتەنگ بوو، تەنانەت چەن شەوێکیش خەونی بینیبوو کە من و منداڵەکەم لە کاتی منداڵبووندا مردووین. مێردەکەم پێی گوتم « تۆ وەکو من بەهێز نیت، بۆیە تۆڕی ڕاوە ماسییەکەم دەفرۆشم و پارەی نەشتەرگەریەکە دابین دەکەم.» ئێمە زۆر هەژارین، ڕێگەم پێنەدا ئەو تۆڕە بفرۆشێت کە بە هۆیەوە خواردن پەیدا دەکەین. من بە هێمنی مامەوە، چونکە من لە مێردەکەم بەهێزترم و باوەڕم بە توانای خۆم بوو. نەک وەکو ئافرەتێک بەڵکو وەکو دایکێک . دوێنێ بەیانی ئازارەکەم دەستی پێکرد، هەموو ئەو شتانەم کرد کە هەموو ڕۆژێک دەمکرد. مێردەکەمم ناردە سەر کار. نانم بە مانگاکان و مریشکەکان دا. دواتر چومە ڕووبارەکە و ئاوم هێنا، نانم ئامادە کرد و ماڵەکەم ڕێکخست. مێردەکەم لەکاتی خۆیدا لە ئیش نەگەڕایەوە. دەمەو ئێوارە نانم بۆ کچەکانم دانا پێم گوتن کە دەبێ یارمەتیم بدەن. لە دەرەوە بارانێکی زۆر دەباری و ئازارەکەشم تا دەهات زیادی دەکرد. داوام لە کچە گەورەکەم کرد کە ئاوی گەرمی زیاتر بخاتە ناو تەشتەکەوە چونکە وام دانابوو لەناو ئاودا منداڵەکەم ببێت. پێم گوتن «ئەگەر مردم بە هەموو کەسێک بڵێن کە دایکمان هێندە ئازا بوو کە دەیتوانی لە پیاوان زیاتر بجەنگێت.» کە مامانەکە گەیشت، منداڵەکە سەری دەرکەوتبوو. مێردەکەم لە دەرەوە مایەوە چونکە نەیدەتوانی ئەو ئازارەی من ببینێت. کە هاتە ژوورەوە منداڵەکە لەسەر سنگم بوو. ناومان لێنا سوخیتان. ئافرەتان بێ هێز نین، زۆر شت هەیە کە ئێمە دەتوانین بیکەین و پیاوان لە توانایاندا نییە. من کێکم بۆ نانی بەیانی دروست کردووە، با هەندێکیش بۆ تۆ بهێنم.



- فویارا

زۆربەی کات لە کۆتا ڕۆژەکانی مانگدا هیچ پارەمان بەدەستەوە نامێنێت. هەندێک کات بەدەم تای توندەوە دەتلێمەوە بەڵام بەزەحمەت دەتوانم بچمە لای دکتۆر؛ دەرمانی ئێمە (دورروود شیفا) یە، کە نزایەکەو هاوسەرەکەم لەژوورسەرمدا دەیخوێنێت. ئێمە لەسەر جێیەک دەنووین کە بەخشت درووستم کردووە، جێگەکە هیچ بەتانی نییە تەنیا بەچەن تووڕەکەیەک دامانپۆشیوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە زۆر باش دەنووین، هیچ شتێک خەوی ئارامیمان لێ ناکات. گەر پێتان وایە خەڵکانی وەک ئێمە لە بەدبەختیدا دەمرین ئەوا زۆر هەڵەن. لەوانەیە ئێمە نەزانین ئەو هەستە چۆنە لە بیستەمین نهۆمی بینایەکدا بنوویت، یان دیمەنی دەرەوە چۆنە لە باڵکۆنەکانتانەوە و یان هەستی سەرکەوتنی ئۆتۆمبێلی تایبەت چۆنە، یانیش تامی مریشکی برژاو چۆنە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە ئێمە خۆشبەخت نین. شەش مانگ لەمەوبەر وازم لەجگەرەخواردن هێنا چوون هاوسەرەکەم پێی خۆش نەبوو. بەڵێنم پێدا کە هەرگیز جگەرە نەکێشمەوە. لەو ڕۆژەوە هەموو هەینییەک جگەرەیەک لە گیرفانمدا دەدۆزمەوە. پرسیارم لێکرد کە ئایا ئەو لە گیرفانمدا دایناوە، ڕووی کرد بەولاوە و ووتی «بۆ من کارگەی جگەرەم هەیە تا جگەرە بەخۆڕایی ببەخشم؟» بۆیە گشت جارێک جگەرەکەی خۆم دەکێشم و ئاسوودە دەبم. گەر پێتان وایە ئەمە هەژارییە، کەوایە پێم خۆشە هەر هەژار بم.

نیجامی چل ساڵ





چل ساڵی ویست تا فێری گۆرانی ووتن بووم بۆ خۆم. لە ڕابردوودا هەمیشە یەکێکم دەویست گوێم بۆ بگرێت، تا پێم بڵێت دەنگمی پێ چۆنە. بە جۆرێک ئاسودە دەبووم بە دڵخۆشکردنی بیسەران، بیسەری ناخی خۆمم بیر دەچووەوە. بیرم دەچووەوە کە دڵم دەتوانێت لەپێشدا گوێی لە دەنگم بێت. لە ئێستادا، بۆ ڕووحم گۆرانی دەڵێم. لەڕێگەی گۆرانی ووتنەوە پێ دەکەنم، دەگریم، خۆشەویستی دەکەم و ڕقیش هەڵدەگرم. کە دەنگم زایەڵەی دێت، بەدڵمەوە پەیوەست دەبێت. من گۆرانیبێژێکم کە بە بەردەوامی ئاواز لەدڵیەوە دەچڕێت، تەنها بۆ ڕوحی خۆی گۆرانی دەڵێت و بۆ هیچ بیسەرێکیش گۆرانی ناڵێت.

– گاتۆکـی سترانبێژ

ڕۆژانێک بوو هەستم بە تەنیایی دەکرد، ئەگەر ڕۆژێک بڕۆیشتمایە بۆ شوێنێک خەڵکی بە جۆرێک سەیریان دەکردم وەک ئەوەی دز بم. ڕق و کینەم لە چاوەکانیاندا دەبینی، وەک ئەوەی تاوانی من بووبێت کە لەسەر شەقامەکان دەژیام یان کە نەمدەتوانی بۆ ماوەی مانگێک خۆم بشۆم.
هەندێ کات لە سوچێکی شەقامێک دادەنیشتم و دەگریام، خەڵکی هاواریان بەسەرمدا دەکرد و دەیانگوت کە بێزارم کردوون پێویستە بە بێدەنگی بگریم.
لەبەر ئەوە بێ هەست ببووم. بە خواردنی بەرماوە لەگەڵ سەگەکان گەورە بووم.
زۆر جاران دەچوومە ڕێستۆرانتەکان و لە پەنجەرەکەوە دەمڕوانی. دەبوو پێش ئەوەی خاوەنی دوکانەکە بێتە دەرەوە و لێمبدات، ڕابکەم.
لە یەکێک لەو ڕۆژانە، نەمتوانی بە خێرای ڕابکەم و کەوتمە سەر زەوییەکە، بەر لەوەی خاوەن دووکانەکە بێت و لێم بدات، کچێک لە ڕێستۆورانتەکە هاتە دەرەوە و هەڵیگرتمەوە و جلە دڕاوەکانمی تەکاند. داوای لێکردم گەر بمەوێت لەگەڵ ئەو بچمە ڕێستۆرانتەکە و نانێک بخۆم. نەمدەتوانی وەڵامی بدەمەوە، دەترسام، هەروەک چۆن هەمیشە لە مرۆڤەکان دەترسام. بەڵام لە کاتێکدا دەستی گرتبووم و منی بردە ناو هۆتێلەکە، هەستم بە جیاوازی دەکرد. لەسەر مێزێک، لە ناوەڕاستی ڕێستۆرانتەکەدا دانیشتم و ئەویش هەموو ئەو خواردنانەی داواکرد کە تەنها دەمتوانی خەونیان پێوە ببینم.



ئەو ڕۆژە خۆشترین ڕۆژی ژیانم بوو. نەمدەتوانی سوپاسی بکەم، قسەم بۆ نەدەکرا. فرمێسک لە چاوەکانم دەهاتە خوارەوە و بە پەلە لەو شوێنە ڕۆیشتم. بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا، شەو خواردنی تازەم لەگەڵ سەگەکانمدا خوارد.
ساڵانێک تێپەڕیوە، ئێستا دەتوانم پارە پەیدا بکەم. ئەو کچە فێری کردم کە دابەشکردنی خواردن یەکێکە لە باشترین دیارییەکان کەسێک بتوانێت ببەخشێت بە کەسێکی تر.
بۆیە هەموو ڕۆژێک سەموون دەکڕم و دەیدەم بەو سەگانەی لەسەر شەقامەکان دەژین. خەڵکی بە شێت بانگم دەکەن. بەڵام کاتێک شەوان من لەسەر شەقامەکا دەخەوتم، ئەو سەگانە لە نزیکی من دەخەوتن. واهەست دەکەم خێزانەکەمم لەگەڵدایە. ئەگەر خۆشەویستی ببەخشیت، زیاتر وەردەگریتەوە. من دڵنیام ئەو خۆشەویستیەی ئەو کچە پێی دام لەو ڕۆژەدا، بە شێوەیەکی گەورەتر بۆخۆی دەگەڕێتەوە. دەپاڕێمەوە هەموو ڕۆژێکی ژیانی پڕ بێت لە خۆشەویستی، خۆشەویستیەکی زۆر ...

– ڕیتۆ